چەنگیز ئایتماتۆف

# قورینگە کۆچەرییەکان

وەرگێڕانی

گوشاد حەمە سەعید

# قورینگە کۆچەرییەکان

نووسینی
چەنگیز ئایتماتۆف

وەرگێڕانی
گوشاد حەمە سەعید

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

## ● قورینگە کۆچەرییەکان

● **نووسینی:** چەنگیز ئایتماتۆف

● **وەرگێڕانی:** گوشاد حەمە سەعید

● **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی

● **بەرگ:** هۆگر سدیق

● **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار

● **چاپی یەکەم ٢٠١٢**

● **تیراژ:** ١٠٠٠دانە

● **چاپخانە:** وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

● **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٨٣٧)ی ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٧٠)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێننەوە**
**www .Kurdchap.com**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## لەمەر ژیان و کارەکانی ئێیماتۆڤ بەکورتی

ئێتماتۆڤ ساڵی ١٩٢٨دا لە گوندی (شەکەر)ی سەر بە ناوچەی (تالاس - تال)ی گرگیزستان لەدایك بووە، نەنکی بۆ ئەو گەنجینەیەکی گەورەو دەوڵەمەندی ئەفسانە و گۆرانیی کۆن و شیعرو راستیییەکان بووە.

زۆرجاران لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەو (هەواران)ـەی بردووە، کە ئاژەڵداریيان تێدا کردووە. بنەماڵەی ئێیماتۆڤ لە ساڵی ١٩٣٥دا بەرەو مۆسکۆ گوێزراویانەتەوە، ئەویش لەوێدا دەچێتە قوتابخانە. باوکی لە یەکەمین کۆمۆنیستەکانی گرگیزستان بووە، هەروەها دایکیشی ژنێکی رووناکبیر و بیرکراوە بووە.

چەنگیز لەناو بنەماڵەکەیدا دەرفەتی خوێندنەوەی رووسی و فێربوونی ئەو زمانەی بۆ رەخساوە. لە ساڵی ١٩٣٧دا خێزانەکەی رادەکەنەوە بۆ گیزستان، چونکە باوکی دەبێتە قوربانیی ئیسلاحاتەکانی ستالین و، لەوێدا لەژێر باری هەژارییەکی سەختدا ژیانیان بەسەر بردووە. لە ساڵی ١٩٤٢دا بەهۆی جەنگەوە دەبوو واز لە قوتابخانە بێنیّ و زۆر کاروباری جیا جیا لە بەڕێوەبەرایەتیی گوندو دەوروبەرەکەیدا بگرێتە ئەستۆ، بەڵام لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگ بۆی لواوە، کە دووبارە بخوێنێتەوەو قوتابخانە تەواو بکات.

لەساڵی ١٩٤٦- ٤٨دا (veterinafachschule قوتابخانەی تایبەتیی قوتابیە بەتەمەنەکان)[1]ی لە دچەمبل دا خوێندوویەتی. لەسەروبەندی ئەو کاتەدا دەست بە نووسین دەکا. لەپاشان دەچێتە کۆلێژی کشتوکاڵی کرگیزستان و ماوەی پێنج ساڵ لەشاری (فرۆنس)دا دەخوێنی، لەساڵی ١٩٥١ ەوە کاری رۆژنامەوانیشی کردووە. دوای تەواوکردنی خوێندنەکەی لە نێوان (١٩٥٣- ١٩٥٦)دا لە کێڵگەی تاقیکردنەوەی ئاژەڵاندا کاری کردوە تاساڵی ١٩٥٦.، کە بەرەو پەیمانگای ـ ماکسیم گۆرگی ـ ئەدەبی بۆ مۆسکۆ دەگوازێتەوەو ئەم نووسەرە لاوە ماوەی دوو ساڵان لەوێدا دەخوێنیّ، لەو سەردەمەشدا یەکەم چیرۆکی (چاو بەچاو دەکەوێتەوە) دەنووسیّ.

لەساڵی ١٩٥٨دا جوانترین چیرۆکی خۆشەویستیی دنیای بەناوی (جەمیلە) نووسی و ئەمەش تێزی خوێندنەکەی بوو.

---

(١) دیارە بۆ ئەو قوتابیانە بووە کەلەبەر باری جەنگ لە قوتابخانە هاتونەتە دەرو دوای جەنگ خوێندویانەتەوە.

چاپبوونی ئەم دوو چیرۆکە لەبەر زۆر هۆی سیاسی مشتومڕێکی زۆری لەسەر کرا. چیرۆکی (چاوبەچاو دەکەوێتەوە) لەگەڵ بەیەکداهاتنی لەگەڵ پاڵەوانێکی لە خزمەتی سەربازی راکردودا.

(جەمیلە)ش وەك هێمای ئافرەتێکی verstender suall تێگەیشتوو، کە یاساو سنوورە قەدەغەکراوەکان دەبەزێنێ. لە ساڵی ١٩٥٩دا دەبێتە سەرنووسەری رۆژنامەی (لیتراتۆری کرگیزستان). لە ساڵی ١٩٦٠ەوە ئیتماتۆڤ وەك پەیامنێری تایبەتی رۆژنامەی (پراڤدا) لە ناوەراستی ئاسیاو کازاخستان کار دەکا. لە ساڵانی دواتردا تاقیکردنەوەی ئەو چەند ساڵ کارەی لەم بوارەدا، دەبێتە هەوێنی چیرۆکەکانی.

لە ساڵی ١٩٦٣دا ئیتماتۆڤ خەڵاتی (لینین)ی ئەدەبی و هونەری وەردەگرێ، لەساڵی ١٩٦٨، ١٩٧٧، ١٩٨٣ دا خەڵاتی دەوڵەتی یەکێتی سوڤیێتی وەردەگرێ. لەساڵی ١٩٦٧ـەوە ئەو لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (نوێ میرـ میری نوێ)دا کاری کردووە، لەساڵی ١٩٧٤ەوەش ئەندامی ئەکادیمیای زانستەکانە لە کرگیزستان.

تا ساڵی ١٩٦٥ چەند چیرۆکێکی وەك (تۆ دار چنارەکەم Dumeine pappel) هەروەها (ماڵئاوایی لە گولساری) و، تا ساڵی ١٩٧٠ (کەشتی سپی) نووسیوە، کە ئەمەش ئەوسا مشتومڕێکی زۆری ناوە، ئیتماتۆڤ لەم رۆمانەدا لەشێوازی پێشووی نووسینی لادەداو شێوازێکی تێکەڵ بەئەفسانە دەهێنێتە ناو کارەکانییەوە.

بڵاوبوونەوەی رۆمانی (رۆژێك لە تەمەنێك درێژتر) مشتومڕێکی توندتر دەنێتەوە، چونکە لەم رۆمانەدا زۆر بابەتی (کۆنترۆ ڤێزە) دژبەیەك باس دەکا.

رۆمانی (Der Richtplatz) وەك یەکەم زەنگی ئەدەبی دادەنرێ، کە پێشبینێ پیرسترۆیکا دەکا.

لە ساڵی ١٩٨٨ تا ساڵی ١٩٩٠ ئیتماتۆڤ سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کرگیزستان بووە، لەساڵی ١٩٨٩دا ئەندامی ئەنجوومەنی باڵای گەلی سۆڤیەت بووە، لەساڵی ١٩٩٠ەوە وەك بالیۆزی وڵاتی سۆڤیەت دەچێتە لوکسومبۆرگ. لەهەمان ساڵدا رۆمانی (هەورە سپیەکەی چەنگیزخان Daisaku lkeda لەساڵی ١٩٩٤ەوە خەڵاتی دەوڵەتی نەمسایی بۆ ئەدەبی ئەورووپی وەردەگرێ. لەساڵی ١٩٩٥ەوە دەبێتە بالیۆزی کۆماری کرگیزستان لە (بروسل). ساڵی ١٩٩٨ یاداشتەکانی خۆی بە بـاوی (سەردەمی منداڵ لە کرگیزستان)دا چاپ دەکا.

وەرگێڕانی: گوشاد حەمە سەعید
لەکتێبی Fruhe Ktaniche
چاپی Union velag 2006

## دلێرەکانی دەشتی ئاکسای

لەسەردەمی جەنگی گەورەی جیهاندا... لەوپەڕی قووڵایی هەرەدواوەی بەرەکانی جەنگدا کارو فرمانە ئەزەلیەکانی ئەو پیاوانەی بۆ بەرەکانی جەنگ چووبوون، کەوتە ئەستۆی ژنان و هەرزەکاران، تا دەگاتە منداڵانیش، منداڵە بەستەزمان و زەحمەتکێشەکان، منداڵی گوندی (ئائیل)ی گرگستانی دورەدەست، کە دەبوایە لە قوتابخانە بخوێنن و لەمەڕ وولاتانی دوورو پڕ لە نهێنی و ئەفسانەیی بە ئارامی خەریکی خوێندن و وەدەستهێنانی زانست و زانیاری و وانەی دژواری ژیان و وێناکردن و بیرکردنەوە بن.

بەڵام لەسەر داواکاریی رێبەری کۆڵخۆز، قوتابخانەیان بەجێهێشت و کەوتنە دوای (ئەسپان)ەوە و بەکاروباری جووت و کێڵ و شۆبڕین و وەرزێرییەوە خەریك بوون، چونکە وولاتەکەیان پێویستی بەنان بوو. دابینکردنیشی ببووە ئەرکی سەرەکیی سەرشانی ئەوان.

چەنگیز ئیتماتۆڤ لەم رۆمانە بچووکەیدا باری زۆر دژواری ئەو رۆژانەو ژیان لە ناو (ئائیل)ێکی نەختێ گەورە و دوور لەبەرەکانی جەنگ زیندوو دەکاتەوە بە تەرزێکی دیارو هەستپێکراو باری ترسناکی کۆلخۆز و ژیانی خێزانیی پیاوێکی کۆلخۆزی، کە بۆ بەرەی جەنگ چووە و منداڵە بچووکەکانی، کە هێشتا هەر قوتابین: سوڵتان مراد و ئاجی مرادی بەجێهێلاوە، لەم رۆمانەدا رەنگ دەدەنەوە.

سوڵتان مراد کەسی بنەڕەتیی رۆمانەکەیەو، برای بەراستی منداڵانی کەمێ لە خۆی گەورەتر بوو، کە لەبەرەکانی جەنگدا دژی فاشیزم لە جەنگێکی هەلاکەتباردا بوون و بەشێکی زۆری ئەوانە لە جەنگ بۆ گوند و دێهاتە رووسی و ئائیلە گرگیزەکان گەڕانەوە و ئەگەر جەنگ ساڵێك دوانی دیکە درێژەی کێشابا نۆرەی سوڵتان مراد و برایەکەیشی دەهات بچنە بەرەکانی جەنگەوە. بەڵام ئەوان ئێستاکە لە بەرەکانی دواوەی جەنگدا ئەرکەکانی سەرشانیان جێبەجێ دەکرد. لەوێدا رەنجیان دەداو زەحمەتیان دەکێشا.

عەشق و سووتانی خۆیان نیشان دەداو فیداکارانە و بەگوڕو توانای لەمرۆڤ بەدەر دا کاریان دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا بەر لە جەنگ ئەوان هیچ شتێکی بەرچاویان لەلایەنی خۆشی و خۆشبەختی ژیانەوە نەبوو بەڵام لەبەر کاریگەری تفت و تاڵیەکانی، کە لە جەنگەوە

سەرچاوەیان دەگرت سەردەمی زوو لە یادەوەریەکانی سولّتان مراددا وەك سەردەمێکی خۆش و پرشنگدار دەیان نواند.

سولّتان مرادێك، کە دڵی هەر بەباوکی خۆش بوو، و ماوەیەك بوو یان هەر بۆ هەمیشە، لە ئائیلی مالوف[٢] دوور کەوتبۆوە.

سەفەرێکی زۆر پێشترێی ئەو بۆشار، رێگای دوورو درێژی چۆل و بیابان لە هاویندا، یادەوەری و هەستەکانی، کە لەدیتنی شار و کڕینی کەلوپەل لە زیهنی منداڵانەی ئەودا وەك گیانلەبەرێکی زیندوو نەخشی کێشابوو. بەلاّم ئەوانە هەموویان پەیوەندیان بەرابردووی ئەوەوە هەیە. ئێستا لەم سەردەمەدا سەرماو سۆڵەیەکی بێداد حوکم فەرمایە و زۆپا لەناو پۆلدا دووکەڵ دەکا و، خانمی مامۆستاش زۆر نیگەرانی کوڕەکەیەتی، کە دەمێکە بۆ بەرەکانی جەنگ چووە، بەلاّم ئەوەی، کە پەیوەندی بە ئایندەوە هەیە واقعێکی دژوارو چاوەدێری ئەسپان، بارینی بەفرێکی ئەستوور لەم چۆڵ و بیابانە و کارو زەحمەتێکی تواناپڕۆکێنی زەوی کێلان دەبێ. سەرئەنجام چیرۆکەکە بەم تراژیدیایانەو کۆتایی پێ دێ، کە سولّتان مرادی پاڵەوانی سەرەکی رۆمانەکە لەسەر لاشەی ئەسپەکەی باوکی کە ناوی چاپدارە بە ورەو توانایەکی خۆڕاگرانە، تاك و تەنیایی لەگەڵ گورگاندا ئامادەی پێکهاتن دەبێ، نووسەر قوتابیانی چوست و چالاکی کۆلخۆزی بەر لەتەمەنی ئەم کارەیان کە بتوانن لە کێڵگەکانی ئاکسایدا کار بکەن بە سرووشتێکی حیماسیەوە ئامادەکردووە، منداڵە ناوبراوەکان لەحەساری گەوڕ و سەر ئاخوڕی ئەسپان ریزیان گرتووە بە بیستنی قسە گەرم و خێرخوایەکانی (تێن عەلۆف)ی سەرۆکی کۆلخۆز، وەفادارانە و بە خۆشحاڵیەوە چاویان لە نیگای ئەو دەبڕی، ئامادەی جێبەجێکردنی هەموو فرمانێکی ئەو بوون. سەرۆکی کۆلخۆز وەبگرە وەك خودی ماناس بەیاڵ و گورزە خۆڵەمیشی و بەژن و بالاّ و سەروسەکوتە ترسناکەکەی و زرێپۆشی وەستا بوو و منداڵەکانیش بەرانبەری ئەو (کە سەرۆکی کۆلخۆزە) وەك پاڵەوانە وەفادارەکانی ماناس قەڵغان لە دەست و شمشێر لەبەر پشتی دەهاتنە بەرچاوان. ئەو پاڵەوان و کوڕە دلێرە پڕشانازیانەی، کە جێی ئومێدی ماناس بوون، کارەکانی خۆی بەوان سپارد بوو کێ بوون؟ بەر لەهەمووان پاڵەوانی بەنێوبانگ سولّتان مراد بوو. هەرچەندە لەوانی دیکە بە تەمەنتر نەبوو و تەمەنی تەنیا (١٥)ساڵ بوو، لەگەڵ ئەوە ئەم سولّتان مرادە کوڕی بەگ بای لەبەر عاقڵی و

---

(٢) ئائیل: رەنگە شارەدێ (ناحیە)بێ.

پڕهۆشی و دڵ گەورەیی و بوێرییەکەی، بەسەرۆك دانرا. پاڵەوانی دووەم ئاناتای پاڵەوانی جێی شانازی هی سێیەم لاوێکی سەرنجڕاکێشی بەنێوی ئارکین بەگ و هی چوارەم ئارگش بوو پاڵەوانی پێنجەم ناوی قوباد قول بوو.

یەك پۆلە پاڵەوانی ئەوها بەرانبەری تین عەلیێف وەستابوون! لەپشت ئەوانەوە لەو دیو شان و شەپیلکە لاوازەکانیان لە پشت سەری ئەوانەوە، کە لەسەر ملێکی لەڕو لاوازەوە گیربوو بە درێژایی ئاخوڕە دوورو درێژەکەی پێنج دەستەی چواری هێستری وەستابوون، کە دەکاتە بیست هێستر، کە دەبوایە بە هەوجاڕی دووگاسنەوە ببەسترێن و بەرەو ئاکسای بچێن.

هێشتا ئەوان ماویانە زۆر گەنجن وبگرە منداڵیشن بەڵام  هەموو ئومێدێك بەوانەوەیە چونکە لە کۆلخۆز دا جگە لەوان کەسێکی دیکە نییە، کە پشتی پێ ببەسترێ و هەروەکو تین عەلیێف دەڵێ: (جووتیار هەمیشە هەست بەترس دەکا و قۆڵیشی لێ هەڵدەماڵێ و هەمیشەش هەر ئۆمێدەوارە). هەرچەندە ئەوان زۆر گەنجن بەڵام  لەگەڵ ئەمەشدا بەهێز و توانان، لەبەر ئەمە، کە هەر لەسەر رێچکەو پیشەی باوکەکانیانن و ئەسپەکانی باوکیان پێ سپێردراوەو زەویە بەهاریەکان بۆ شۆبڕین چاوەرێیان دەکا ئەوکەسانە لاپەڕەیەکی زۆری ئەم چیرۆکەیان پڕکردۆتەوەو باشترینیشیان ئەو هەستانەی سوڵتان مراد و میرزا گولی هاوپۆلیەتی ئەو هەستانەی تازە لە کنیان سەری هەڵداوە و بێدار بۆتەوەو هێشتا هەر منداڵانەن و بە ئاڵۆزی و دژواری پەیوەندیە منداڵانەییەکان پەیوەندیی بە ئاناتاوە هەیە. ئاناتای لەهەموو منداڵەکان بەتەمەنتر بوو، کەمێ توند خووەو بەڵام  بەگشتی کەسێکی خراپ نییە. پرسەی باوکی ئاناتای، کە لەجەنگدا کوژراوە دەبێتە بۆنەیەك ئاشتبونەوەی سوڵتان مراد و ئاناتای لێدەکەوێتەوە، کە زۆر کاریگەرە، بەڵام  رەنگە باشترین و جوانترین لاپەڕەکانی ئەو داستانە ئەو لاپەڕانە بن، کە کوڕەکان خەریکی شۆبڕین و کێڵانی زەوین لە چۆڵ و بیابانی ئاکسای سەرد و سڕدا. لەو شوێنەدا لە پێشی هەرە پێشەوە سوڵتان مراد و بەدوای ئەوەوە لە ماوەی دووسەد هەنگاوێك دا ئاناتای و، ئینجا ئارکین بەگ هەرسێکیان لەیەك ڕیزدا بۆ ماوەی نیو کیلۆمەتر زەویان دەکێڵا ئەو رۆژە ئەوان بەتەنیا لەم زەوی و وەردانەداکاریان دەکرد. سێ جووتێرو کێوی گەورەگەورە لەبەر سێ جووتێر چۆڵ و هۆڵاییەکی زۆر لەپشتیانەوە لەم بیابانەدا کار دژوار و سەخت بوو، تاقیکردنەوەی گیروگرفتان چاوەڕێی ئەو کوڕێژگانەی دەکرد. سوڵتان مراد رووبەڕووی بارێکی سەخت ببۆوە، کاتێك کەمنداڵەکان خەریکی جووت و کێڵ بوون لەو دەوروبەرانەدا کەسانێك کەهەر دەڵێی دڕندەن و بۆنی نێچیریان کردووە، دەکەونە هات و چۆو

هاتوچۆكانیان ئاسایی نییه. ئەوان چاوەڕێی دەرفەتن. هەر كە لەئاسمانی ئەو دەشت و دەرەدا یەكەمین دەستەی قولنگان لە ئاسماندا دەكەونە زریق و باق، كوڕەكان گاسن و هەوجاڕەكانیان بەجێدەهێڵن و بەرەو ئەو جێ و شوێنە ڕادەكەن كە قولێنگەكانی لێدەنیشنەوە. لەو نزیكانە لە كەندەڵانێكدا چاوێكی قایم و بێ بەزە بەبێ ترووكان چاوی لەسەر سێرە هەڵناگرێ و یەك لەدوای یەكدا سێرە لەسەر سێ قولنگان دادەگرێ. هەر ئەو چاوە بەو پەڕی بێزاری و نەفرەتەوە لەسەری سێرەی تفەنگەكەوە دەڕوانێتە كوڕێژگەكان، كە بەرانبەری لوولەی تفەنگەكە بەرەو قولێنگەكان رادەكەن. ئەم میوانە ناوەختانەی ئەم ئاقارو چۆڵاییە منداڵەكان ناكوژن. ددانی خۆیان بۆ ئەسپە خڕو پڕەكانیان دەسوونەوەو شەو چواردانەیان لێدەدزن. سوڵتان مراد ئەم پاڵەوانە بێ باكە بە سواری چاپدارەوە سەرادوویان دەنێ و لەم كاتەدا گوللەی دزو جەردان ئەسپەكەی ئەو دەپێكێ... .

بەڵێ ئەم رووداوە دوور لەبەرەكانی جەنگ، لە هێلـەكانی دواوە لـە چـۆل و هۆڵاییـەكانی ئاكسای روو دەدا، چونكە لەو شوێنەشدا وەك بەرەكانی جەنگ دەستی بەكار خاراو و دڵی پـڕ مەردایەتی پێویست بوون، لەبەر ئەوەی لەم شوێنەشدا خـەبات و تێكۆشـان و ژیـان، پـڕ لـە نامرادی و تەنگ و چەلەمە و كارەسات بوو. ئەم بارە بێ هۆ نەبوو، جـەنگێكی گـەورە رووی دابوو. جەنگێك كە ئامادەگیی قوربانیـدان و دلێـری لـە دڵـی خەڵكیـدا پـەروەردە دەكـرد و باشترین منداڵانی (ئائیل) ئەمەیان سەلماند.

ئێستا لەبارەی پەلەكردنی پێگەیینی جەوانانەوە، كـە رەنگـە بەتـەواوی لەگـەڵ واقیعـدا هەماهەنگ بێ خواستی خۆیان دەڵێن و دەنووسن. لەهەمان كاتدا گومان لەوەدا نییە، كە لـە پێگەیشتنی كۆمەڵانی لاوانـدا، لایـەنی دواكـەوتووش هەیـە، كـە هەمیشـەش بـە شـێوەی قەناعەت پێكردن رێنمایی دەكرێ. لەگەڵ ئەمەشدا ئەمە بەسە، كە سەرنجێك بدرێتە رێـڕەوی سالانی جەنگ تاكو زۆر لایەنی لێ رۆشن ببێتەوە.

هــەر ئــەو ســوڵتان مــرادە پــانزە ســاڵە، وازی لــە قوتابخانــەی هێنــاوە و ئــەو پۆلــەی بەجێهێشتووە، كە كیژۆڵە ژیكەڵەكەی تێدا دەدیـترێ، شـانی داوەتـە بـەركاری زۆر دژوار بـۆ بەرهەمهێنانی دانەوێڵەو كۆكردنەوەی خەلەو خەرمان، بەم كارە ئاشنابوو و بەگژ رێگرانیشدا هاتەوە. ئەو لە كارو چاودێری و سەرپەرشتیەكانیدا ئەركەكانی خـۆی نـەك وەك لاوان بـەڵكو وەك پیاوان بەدەر خست، پێگەیشـتنی كۆمەڵایـەتی پێشـوەختی ئـەو لەچـاو تەمەنیـدا زۆر پێشكەوتووە.

نووسەر لەم داستانە بچووکەیدا لەوەدا سەرکەوتووە، خواستێکی زۆر و زەبەنگ ئاشکرا بکاو نەك تەنیا لە دەوروبەری دژواری ئەو رۆژانەدا رەنگی پێ بداتەوە، بەڵکو لەنێو ئەوساکە و ئێمرۆدا پردێك دروست بکا، پردێك، کە پێویست دەکا و دوو رۆژگار و سەردەم بە بیرو ئایدیای باش پێکەوە ببەستێتەوە.

## واسیل بێگۆڤ:

خاتوونی ماموستامان ئینسکەمان ئاپای لەسەرمانا خۆی لەناو شاڵێکی خوریی درشتچنراو پێچابوو، لەوانەی جوگرافیا و لەبارەی سەیلانەوە ئەو دوورگە ئەفساناویانەی، کە کەوتبووە ناو ئۆقیانووس لە نزیك کەنارەکانی وولاتی هیندوستاندا قسەی دەکرد.

ئەم سەیلانە لەسەر نەخشە لەژێر وولاتی هیندوستاندا لەوێنەی دڵۆپێك ئاو دەچوو بەسەری گۆی مەمکێکدا شۆڕ بووبێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا بەپێی قسەکانی خانمی مامۆستا، چی هەیە لەم دنیایەدا لە هیندوستاندا نەبێ: لە مەیمونت دەوێ، فیل، مۆز(کە جۆرە میوەیەکە)، باشترین جۆری چای دنیا، هەموو جۆرە میوەیەکی سەیر و سەمەرە و گژوگیاییێکی بێوێنە و هەموو چشتێکی، کە تۆ دەتەوێ لەوێدا هەیە. بەڵام ئەوەی پیاوی دەکوژرێ گەرماکەی ئەوێیە. ئەوێ هێندە گەرمە کەساڵ دوانزە مانگ مرۆڤ نارەحەت نابێ و، نە چەکمەوپێڵاو، نە کڵاو سەرپۆش، نە گۆرەوی و پۆزەوانەی خورو[3]، نە پاڵتۆی کەوڵ و پێستەکە ئاگر و چیلکە و چەوێڵ، هەرباس مەکە، هەرگیز وا رووناد‌ا لە ئاقاران بۆی بگەڕێ و بە کۆڵەپشتە، گیشەو دەستەی گران و سەنگینی دار و چیلکە و بنچك و دڕیان بە نقەنق بکێشنە ماڵەوە. ئەگەر یەکێك لەوێ بژی چۆنی دڵت دەیەوێ، دەتوانی کاتی خۆت ئەوها بەسەر ببەی ئەگەر بتەوێ لەبەر هەتاودا خۆت هەڵقرچێنی، نەتەوێ دەچیە بەر سێبەر و خۆت فێنك دەکەیەوە. لە سەیلان رۆژ و شەو هەر گەرمە، چ نیعمەتێکە، هاوین لەدوای هاوین دێ. هەرچەندەی حەزت لێبێ، حەزدەکەی لە سەحەرەوە تا شەو دادێ دەتوانی مەلە بکەی. کە لەمە بێزار دەبێت دەتوانی بچیت راوی ووشتر مریشکان بنێی، ووشتر و مریشك لەوێ هەن، حەتمەن هەنە ئەم پەلەوەرە زەبەلاح و گێژو و ڕانە ئەگەر لەوێ نەبن ئەدی لەکوێ هەن؟ مەلی ژیر و زیرەکێش لە سەیلان هەنە! بە دڵنیاییەوە بەتووتیشەوە حەز بکەی تووتی دەگری و فێری گۆرانی و

---

(٣) خورو: خوری

پێکەنینی دەکەی، فێری سەمای دەکەی، بۆچی نا، تووتی هەموو شتێك فێر دەبێ و دەتـوانێ هەموو کارێك بکا.

تەنانەت دەبێ جۆرێکی خوێندەواریشی هەبێ و بتـوانی بخوێنێتـەوە یـەکێك لـە خـەڵکی گوندەکەمان تووتیەکی خوێندەواری وای بەچاوی خۆی لەبازاڕی جمبۆلدا دیتوە. رۆژنامەیان بۆ رادەگرت وەك ئاو و دۆ دەیخوێندەوە.

وەی بابە... . ئینجا چی لە سەیلان نییە، هەر سەیر و سەمەرەیەکی بـیری لێبکەیـەوە لەوێ هەیە. لەوێ مرۆڤ بە ئاسانی و بێ سەر ئێشە دەژی. تـەنیا دەبـێ لەبـەر چـاوی خـاوەن موڵك نەبێ، چونکە ئەو هەمیشـە قامچـی بەدەسـتەوەیە و بەسـەرو گـوێلاکی سـەیلانیاندا دەکێشی، وەك بڵێ نۆکەری ئاڵقە لەگوێی ئەون. سـەگبابی زۆردار! دەبـێ وای لـەبنا گوێیـان بسرەوێندرێ. ئاگری لە چاوان بەرزکەیەوە و ئینجا قامچییەکی لەدەست بسـتێنی و بـەزەبری قامچیان ملکەچی بکەی، کە خۆی کار بۆ خۆی بکا. ئەسڵەن نابێ لە بەرانبەری وەبەرهێنن و سەرمایەدارەکانی دیکەش هیچ تێبێنییەك بکەی، لەگەڵ ئەواندا بەهیچ جۆرێك قسە نـاکرێ، لێگەڕێ بابڕۆن بۆ خۆیان کارێك بکەن و، هەر ئەوەندەو بەس. دیارە، کە فاشیست و خوێنڕێژان لە نێوان ئەواندا پەیدا دەبن و جەنگیش هەر لەوانەوە سەرچاوە دەگرێ... . چەندان لە خەڵکی (ئائیل) لە بەرەکانی شەڕدا کوژران. دایکم هەموو رۆژێك سەری لە گریانە، هیچ قسەیەك ناکا تەنیا دەگریە، دەترسێ بـاوکم بکـوژرێ ئـەو بەژنەکـەی هاوسـامانی گوتـووە ئەگـەر بـاوکی منداڵەکانم بکوژرێ بەخۆم و چوار منـداڵی سـەلکە وینکـەوە قـوڕی کـوێ بەسـەری خۆمـدا بکەم... .

مامۆستا خاتو ئینسکەمال ئاپای لە پۆلە ساردەکەدا لەسـەرمان خـۆی کـووڕ کردبـۆوە و هەرکە منداڵەکان کۆخەیان دەهاتی، بە حەوسەڵەوە چـاوەڕێی تـەواوبوونی کۆخەکۆخەکـەیان دەبوو، ئینجا لەمەڕ سەیلان و دەریاو وولاتە گەرمە سێرەکانەوە درێـژەی بـە قسـەکانی دەدا. سوڵتان مراد، کە بەقسەو وەسپەکانی مامۆستاکەی باوەڕی دەکردو نە دەکرد، (ئاخر وادەهاتە بەرچاوان، کە لەو وڵاتانەدا بارەکە لەڕادەبەدەر باش و خۆش بێ) لەو ساتەدا لەکرۆکی دڵییەوە داخ و حەسرەتی ئەوەی بوو، کە بۆچی لە سەیلان ناژیێ و هەر لەهەمان کاتدا، کە بەتی چاوی تەماشای ئەو دیوی پەنجەرەی دەکرد لەبەر خۆیەوە بیری لەوە کردەوە (ئەوێ بـۆ ژیـان زۆر بـێ وێنەیە).

ئەو دەیتوانی بەروالّەت چاو لەمامۆستاکە ببڕێ و لە راستیشدا تەماشای دەرەوەی پەنجەرە بکا، بەلاّم لەو دیوی پەنجەرە شتێکی گرنگ روی نەدەدا و کەش و هەواش خراپ بوو. هوردە هوردە دایکردبووە نیگرە[٤] و بەفر بارین و بەر شووشەی پەنجەرەکان توێژێك شەختەی گرت و پەنجەرەکە لێلّ بوو.

ماجومی لێوارەکانی شوشەکانی پەنجەرەکە لەسەرما هەلّیان دابوو و لەهەندێ جێگادا دەرپەڕیبوون لە هەندێ شوێنی دیکە کەوتبوونە ناو تاقی مەرەکەباوی پەنجەرەکەوە. ئەو بیری کردەوە (کە لە سەیلان نابێ ماجوومی پەنجەران پێویست بێ، بەکەلّکی چی دێ؟) لەوێ پەنجەرە بۆچییە و لە راستیدا مالّیش پێویست نییە. ئەوە بەسەکە مرۆڤ تەنیا ژوورێکی لە حەسیر بۆخۆی دروست بکا و سەرەکەی بە گەلاّو قامیشان بگرێ.

بەردەوام با لەپەنجەرەکەوە دەهات و تا گوێت لێدەبوو، کە چۆن با لە درزەکانی چوارچێوە دارینەکە دزەی دەکرد و فیکەی دەکێشا. لاتەنیشتی راستی سولّتان مراد، کە کەوتبووە لای پەنجەرەکەوە لەسەرمان رەقی کردبوو. ئەو دەبووایە تەحەمولی ئەوە بکا، مامۆستا خاتو ئینکەمال ئاپای خۆی ئەوی لێرە لە نزیکی پەنجەرە داناوەو پێی گوتبوو (سولّتان مراد، لە پۆلەکەدا تۆ لەهەموان بەهێز و با خۆشتری و دان بە خۆتدا دەگری) پێشتر بەر لەوەی سەرما دابێ لە جێی ئەودا ئەو کچۆلّە واتە میرزا گولّ دانیشتبوو، ئەو سولّتان مرادیان جێگۆرکێ پێکرد جێگاکەی پێشووی سولّتان مراد ئەوەندەی بای لێوە نەدەهات، بەلاّم چیتر بوو و میرزا گولّیان لەوێ لەلای چەپدا دانایا بەم شێوەیەش سولّتان مراد بە لەشی خۆی پەنای لە کچۆلّەکە دەکرد و نەیدەهێشت با بیگرێتەوە، ئێستا ئەوان لە کەناری یەکدیدا دادەنیشتن و سولّتان مراد حەوجەی ئەوە نەبوو، کە تەنیا لە کاتی زەنگلێدان و پشوودا بچێتە کن ئەو و ئەویش لەشەرمان سوور هەلّگەڕێ، عەجیبە ئەو شەرم لە هیچ کەسێك ناکا بەلاّم هەرکە سولّتان مراد بەلایدا رەت دەبێ، سوور دادەگەڕێ و رادەکا. ناکرێ بەدوای ئەودا ڕاکا بە خەلّکی پێدەکەنن ئەم کیژانە هەمیشە دەتوانن جۆرێك بیر لە مرۆڤ بکەنەوەو لەسەر دەروو دیوارانـدا بنووسن (سولّتان مراد+ میرزا گۆلّ= یەك عاشقن (دوو عاشق) ئەگەر لە تەنیشتی یەك دانیشین کەس قسەو قسە لۆکمان بە دوواوە ناکا... .

---

(٤) نیگرە: ئەو دەنکە لوس و بچوکانەی بەفرە، کە سەرەتا دەبارێ و زەوی دادەپۆشی و دەبێتە هۆی نەتوانەوەی کۆ بەفرەکانی، کە لەدواییدا دەبارن.

لەو دیوی پەنجەرەوە با گڤەی دەهات و بەفریش هەر دەباری ئەو رۆژانەی، کە ئاسمان سامالْ بێ لە پەنجەرەی پۆلەوە چیاکان بەدیار دەکەوتن.

قوتابخانەکە بەسەر گردێکەوەیە و بە باشی دەنۆڕێتە سەر دێیەکە، دێیەکە لە ژێرەوە و قوتابخانەکەش لە سەرەوەیە هەر لەبەر ئەمەیە، کە لێرە لە قوتابخانەوە بەر مەیدانی دیتن فراوانترەو چیایە دوور دەستە بە بەفر داپۆشراوەکان وەك تابلۆیەکی نەخشێنراو دەبینرێن ئێستاکە ئیدی لەناو ئەو هەوای کڕێوە و بەفر بارینە پەیکەری گرژو مۆنیان دەبیندرێ.

دەست و پێ و پشتی مرۆڤ لەسەرمان دەیبەستێ. پۆلەکە چەند ساردە ئەو وەختانەی بەر لە جەنگ قوتابخانەیان بە تەپالأن[٥] گەرم دەکردەوە. تەپالە وەك رەژوو باش دەسووتێ ئێستاکە دەهێنن و دەیسووتێنن. ئەم کایە لەناو سۆپان تەنیا قرچە قرچیان لێوە دێ و بەکەلْك نایە. هەر دوو رۆژی دیکەیە ئەم کایەش تەواو دەبێ.

کە ئەویش هەر خاك و خۆلْ و زبلْ و زار بوو و بەس، چەند حەیفە، کە ئاو هەوای ناوچیاکانی تالاس وەك وولأتە گەرمەسێرەکان نییە. ئەگەر ئاو و هەوا بەجۆرێکی دیکە دەبوو، ژیانیش جۆرێکی دیکە دەبوو و ئێمەیش فیلمان دەبوو و سواریان دەبووین وەك چۆن سواری گاجووتان دەبین ترسی نییە. بەر لە هەمووان من سواری فیل دەبووم و رێك لەسەر سەری لە نێوان هەردوو گوێ دا دادەنیشتم هەر بەو تەرزەی لەناو کتێبی دەرزەکاندا هەیەو لە (ئائیل)ەوە بۆی دەردەچووم. ئەو وەختە خەلْکی لەهەموو لایەکەوە بەرەو لای من دەهاتن و دەیان گوت (ڕاکەن، باش تەماشاکەن، سولْتان مراد کوڕی بەك بای سواری فیل بووە).

ئەو کاتە میرزا گولْ تەماشای دەکرد و داخی دەخوارد... ئەو وا دەزانێ شابانوێیکی جوانە و نابێ بەلای ئەودا بچێ. هەروەها، مەیموون و تووتیی رۆژنامەخوێنیشم لە دواوەدا لەسەر پشتی فیلەکە دادەنا، و جێگای دەبۆوە. دەکرا جێگای هەموو پۆلەکەش لەسەر گردەی ملی فیلەکە بکرێتەوە. ئەمە روون و ئاشکرایە، ئەمەی لەکەس نەبیستووە، خۆیشی ئەمە دەزانێ.

ئەو فیلی زیندووی بە چاوی خۆی دیتووە. هەموو ئەمە دەزانن ئەو مەیمونی زیندوو و ئاژەلْی دیکەیشی دیتوە لە گوندەکە (ئائیل) هەموو کەسێك ئەمە دەزانن خۆیشی زۆرجاران ئەمەی باس کردووە ئەوساکە ئەو بەخت رووی تێکردبوو... . .

---

(٥) لە ئەلْمانیەکەیدا دەلْێ: بە پشقلان (schafsmist).

پێشی جەنگ، یەکسالّی ڕێك پێشی جەنگ ئەم ڕووداوە خۆشە لە ژیانی ئەودا رووی داوە. هاوین بوو دروێنەیان دەکرد ئەو سالّە باوکی بەکبای سووتەمەنیی لە جەمبۆلەوە بۆ ویستگەی نەوتی پارکی مەکینەو تەراکتۆرەکان دەگواستەوە. هەر کۆلخۆزێك دەبوایە بۆ گواستنەوەی بار شتێك بۆ گواستنەوە دابین بکا. باوکی بە سوعبەت و گالّتەوە خۆی هەلّدەکێشا[٦] و دەیگوت: من شوفێرێکی سادەی عارەبانان نیم. کۆلخۆز بەرانبەر من و ئەسپ و عارەبانەکەم پارەو کرێ لە خەزێنەی دەولّەت وەردەگرێ. من ئەم پارەیە دەرێژمە ناو بەریەی کۆلخۆز. لە خۆڕا نییە، کە ژمێریاری کۆلخۆز هەر چاوی بەمن دەکەوێ لە ئەسپەکەی دادەبەزێ و سەلامم لێدەکا... .

عارەبانەکەی باوکم بەڕادایی بۆ بارکردنی نەوت دروست کرابوو. جێگای باری نەبوو لە چوار چەرخە و دوو بەرمیلی ئاسنین و لە پێشی پێشەوەش جێگای دانیشتن و کوشنی عەرەبانەچی پێك هاتبوو. هەر ئەوەندەش بوو و بەس لە شوێنی دانیشتنی عەرەبانەچیەکە دەکرا دووکەس دانیشێ و جێگای سێ کەس نەدەبۆوە بۆ ئەمەش دوو ئەسپی باش و بەهێزیان دابووە باوکی.

ئەسپێکی یەختەی شین، کە ناوی چاپدارو ئەسپێکی یەختەی دیکە، کە ناوی چونتور بوو. زین و قایش و قروشیان دلّگیر و تێرو پڕ بوو. کۆپان و قایش و قروشی لە چەرمی دەولّەتی قەتران لێدراو دروست کرابوون، کە هەرگیز لە باریەك نەدەچوون و نەدەپچڕان ئەو بارکێشانە بەردەوام و دوورودرێژانە بەبێ‌ی ئەمجۆرە کەلوپەلە چاکانە نەدەکرا. باوکم لە کارکردندا حەزی لە توندوتۆلی و ڕێکوپێکی بوو و هەمیشە ئیسراحەتی ئەسپەکانی لەبەرچاو دەگرت. کاتێ چابدار و چونتور بەیەك هەنگاوی هاوئاهەنگ و هاوتەریب غاریان دەدا و بالّەکانیان بەبای غارێ دەجوولّانەوە، هەر لە دوو ماسی دەچوون، کە لە تەنیشتی یەکەوە مەلە بکەن. تەماشاکردنیان تام و چێژی دەبەخشی. خەلّکی بەبیستنی دەنگی چەرخەکانی عارەبانەکە لە دوورەوە ئەویان دەناسیەوە و دەیانگوت: (بەکبای بەرەو جەمبول دەڕوا).

چوون و هاتنەوە بۆ جەمبول دوو رۆژی دەویست. هەر کە بەکبای دەگەڕاوە ئەوەندە سەرحالّ و بەکەیف بوو دەتگوت هەرگیز سەدو ئەوەندە کیلۆمەترەی نەبڕیوە خەلّکی سەرسام دەبوون و دەیانگوت: (عارەبانەی بەکبای وەك شەمەندەفەر دەڕوا). سەرسامیەکەیان لە خۆڕا نەبوو. دەکرا ماندووبوون و بێ پەروایی ئەسپەکان لە دەنگی ووشك لێکخشانی چەرخەکانی

---

(٦) ئەم ووشە لە ئەلمانیەکەی ئەوهایە و لە فارسیەکەم پێ جوانتر بوو. ل ١٣

عەرەبانەوە بزانرێ تا عەرەبانە بەم تەقە تەقە بە کەنارتدا رەت دەبێ. مرۆڤ چین چین گۆشت بەردەدا. ئەسپەکانی بەکبای هەمیشە زیرەك و چاپوك رێیان دەکرد. رەنگە هەر لەبەر ئەمە بوو گواستنەوەی بەرپرسیارترین باریان بەو دەسپارد.

بەڵێ پێرار هەر، کە قوتابخانە تەواو بوو پشوو دەستی پێکرد باوکم گوتی:

ـ ئەگەر بتەوێ دەتبەمە شار.

سوڵتان مراد لە خۆشحاڵیان خەریك بوو هەناسەی بیگرێ ئایا باوکی چۆن زانی، کە ئەو ماوەیەکی دووروو درێژە دڵی بۆ دیتنی شار لێ دەدا ئاخر خۆ ئەو لەژیانیدا جارێکیش نەچوو بووە شار، ئای کە خۆشە، باوکی بە گەفێکی پڕ لەگاڵتەوە گوتی: (بەڵام نابێ دەنگت لێوە بێ. کەس نەزانێ دەنا بچووکەکان دەیکەن بە بەزم و ژاوەژاو ئەوساکە تۆش نابەم).

باوکم راستی دەکرد ئەم حاجی مرادە، کە سێ ساڵ لەمن بچووکترە هیچ کاتێك و لەسەر هیچ شتێك نەیدەبڕیەوە، وەك کەری دێزە بەرعەکسی دەکا، کاتێ باوکم لە ماڵەوە بوو، حاجی مراد نەیدەهێشت و ماوەی نەدەدا بچینە لای. دایم و دەرهەم هەر لە دەورو قوونی ئەودا دەخولاوە، وەك بڵێی هەر ئەو بەتەنێ هەیەو ئەوانی دیکە بە مرۆڤ دانانرێن.

تاوەکو دوو خوشکی بچوکتریش، کە ئەوکاتە زۆر بچوك بوون، بەگریان و زاری ئینجا دەیانتوانی نەوازشێکی باوکە بەدەست بێنن. هاوسێکانیشمان سەریان لەوە دەرنەدەکرد، کە بۆچی کوڕە بچکۆلەترمان ئەوەندە هۆگری باوکیەتی. دایە گەورە ئارواوکان، کە ژنێکی سەرسەخت و وەك تەختەدار ووشك بوو دەنگێکی قرەقری هەبوو ئێمە هەموومان لێی دەترساین! چەند جاران بە ئەنگوستە زورەکانی[٧] لەبنا گوێ حاجی مرادی رەبادا بوو[٨] و پێی گوتبوو:

ـ ئاخر، هەی بێ مێشك. ئەوەندە خۆت لە بابت هەڵمەسوو. باش نییە! ئەمە چ وەزعێکە ها! مەگەر دەبێ، کە کوڕە چکۆلانە ئەوەندە بۆ باوکی زیندووی، خۆی دڵتەنگ بکا؟ بزانە ئاخر و ئۆخری رەفتاری ئەم منداڵە بەلایەکمان بەسەر دەهێنێ.

دایکە بۆ لەبۆڵێك دەکاو هەندێ جوێن دەداو شەپە زللەیەکیش بە بناگوێی حاجی مرادا دەکێشی.

---

(٧) زور: زبر.

(٨) رەبادان: بنا گوێ راکێشان. هەڵقورینجاندن. لێ بادان. گرتنی گۆشتی لەش و بادانی بەدوو پەنجە.

بەلاّم  ناوێری هەڵگەڕێتەوە هەموو حساب بۆ دایە گەورە دەکەن.

دایە گەورە ناحەقی نەبوو و بێ ئەسەل نەیدەگوت هەرواش بوو. مرۆڤ دڵی بە حاجی مـراد دەسووتێ. ئەو ئێستا گەورە بووەو پۆلی سێیەمە. هەوڵ دەدا بەرووی خۆیـدا نـەهێنێ. لەبـەر چاوی دایکمان بەسەر خۆی ناهێنێ، بەلاّم  لەکرۆکی دڵەوە چـاوەڕێ دەبـوو (باوکمـان ئێمـرو سبەیێك لەبەرەی جەنگ بگەڕێتەوە).، کە دەچێتە نـاو جێگـاو دەیـەوێ بنـوێ وەك مرۆڤـی گەورەو بەساڵاچوان، کە شەو دوعا دەخوێنن لەژێر لێـوەوە دەڵـێ: (خوایـە تـوبی و کـارێکی وابکەی بابەم سبەینێ بێتەوە). هەموو شەوێك ئەمە پیشـەیەتی. منـداڵێکی سـەیرە وا بـیر دەکاتەوە هەرکە لەخـەو بێـدار بـۆوە موعجیزەیـەك روودەدا و بارەکـە بـە لایێکـی دیکـەدا دەگۆڕێ، تەنیا گرنگ ئەمەیە بابمان بەزیندوویی لە جەنگ بگەڕێتەوە با ئەوکاتە هەموو کات هەر لەگەڵ حاجی مراد بێ و یاری لەگەڵ دا بکاو لەقەڵان دۆشکێی کاو لـە باوەشـی بگـرێ. تەنیا بێتەوە بۆ ئەو، ئەوە بەسە ئەو باوکی بە زیندوویی ببینێتەوە ئـەم خۆشـی و شـادیە بـۆ سوڵتان مراد بەس بوو. ئای، کە خۆش دەبوو ئەگەر باوکی دەهاتەوە.

ئێستا حەزی دەکرد هەمان شت رووب داتەوە کاتێ، کە باوکی لە کەناڵی (چو)دا بـۆ نـاو خێزانەکەی گەڕابۆوە، ئەو پێرار هاوین بۆ بەشداریکردن لەکاری بیناسازیدا بۆ پێـنج مانگـان چووبووە ئەوێی و، سەرا تاسەری هاوین و پـاییز لـەوێ مـاوە و خـاك و خـۆڵی کێشـاوە وای کارکرد، کە بووە کرێکاری ئیستاخانو[9].

سەر لە ئێوارەیەك بەرە بەری رۆژ ئاوابوونێ سەرسەکوتی پەیدا بـۆوە. لـەپڕ تەقـە تـەقی چەرخەکانی عارەبانەی باوکم لەناو حەوشەدا دەهاتە گوێ و ئەسپەکان فڕەفـڕی کونـە لوتیـان دەهات منالاّن لـە جێگـای خۆیانـدا ڕاپـەرین و هەڵزۆقینـەوەو دایانـە هـاوار هـاوار: (بابـە هاتۆتەوە. بابە هاتۆتەوە) باوکە چنکێك پێست و ئێسقانی لێمـابۆوە، زۆر لـەر و لاواز ببـوو، لەبەر هەتاو هەڵقرچـابوو وەك قـەرەجان سـەرو ریشـی هـاتبۆوە، بـە دەردی دایکـم گۆتـەنی جلوبەرگی وەك سواڵکەران بوو، تەنیا چەکمەکانی نوێ بوون و لە چەرمی کرۆم بوون.

---

(٩) ئیستاخانو ئەلکسی گریگۆریویچ ـ مەعدەن کار لە ساڵی ١٩٣٥ لە ماوەی ٤٥ دەقە سەدو دوو تۆن خەڵوزی کێشاوە، لە کاتی ئاساییدا تەنیا (٧) تۆن بوو، دوای ئەم داهێنانە لەسەرانسەری سۆڤیەتدا راپەرین و پێشکەوتنێکی بەرفراوانی ئستاخانوی دەستپێکرد

ئا لەو کاتەدا حاجی مراد بەر لەهەموان خـۆی گەیانـدێ و خـۆی هاویشـتە باوەشـێی و پێوەی نووساو بەری نەدا بە هەنیسك دانەوە دەمی لە گریان نابوو نەیدەبڕیەوە

ـ بابە، بابە گیان، بابە... . هۆ بابە گیان.

باوکیشم ئەوی توند لە ئامێزگرت و فرمێسك لە چاوەکانیدا سەریان کـرد، لـەم وەختـەدا هاوسێکان بەسەر ئەم دیمەنە راگەیشتن و بە دیتنی ئەم دیمەنە ئەوانیش دەستیان بەگریان کـرد، بەڵام دایکم بە دەست و پێ تێك ئالاوی و خۆش خولقیـەوە وەك لـە رەفتـاری حـاجی مـراد شەرمەزاری دایگرتبێ رایکرد تا حاجی مراد لە باوکم دوور خاتەوە و گوتی:

ـ واز لە بابت بێنە، بەسە ببڕێنەوە، مەگەر تەنیا تۆ لەم ماڵەی، وازبێنە ئەوانی دیکـەش دەیانەوێ بچنە کنی، عەجەب بێ مێشك و بێ شعوری، مەگەر نابینی خەڵك هاتون سـەلام و ئەحواڵ پرسی لێبکەن... .

بەڵام ئەم قسانە بەدادی حاجی مراد رانەگەیشت!

سوڵتان مراد هەستی کرد شتێك لە دەروونی ئەو کەوتە جوولە و وەك ئەمە بوو گرێیـەکی لە قورگی هاتبێ و گەرووی بگرێ لە ناکاو تام سووراوکێکی لەناو دەمیدا هەستپێکرد. حاجی مراد هەر ئەو پیاوە بوو دەیگوت: قەت لەم دنیایەدا بۆ هیچ شتێك ناگریەم، بەڵام یەکسـەر ژێر بۆوەو سەرحاڵ بۆوە و هاتەوە سەرخۆ.

دەرس بەردەوام بوو. ئینسکەمال ئاپای ئێستاکە لە بارەی (جـاوە)وە لـە بـارەی بۆرنـۆ و ئوسترالیاوە قسەی دەکرد. دیسانەوەش قسەی لە سەر زەمینە خۆشەکانی هەمیشـە هـاوین و گیانلەبەری وەك تیمساح، مەیمونەکان، درەختی خورماو شتی جیاجیای نـەدیتراو نەبیسـتراوی ئەفسانەویەوە بوو. تۆ باسی کەنغەر بکە لـە هـەمووان سـەیر تـرە، بێچـوەکەی خـۆی لـەناو کیســەیەکدا هەڵـدەگرێ کەبــە ســکیەزە نووســاوە و بــە بەچــکەوە حــەمبازان دەهــاوێ و بێچوەکەیشی لەگەڵ خۆی دەبا، کەنغەر یان راستترە بڵـێین سرووشـت ئـەم بیرۆکـەی چـۆن بـۆ هاتووە... .

ئەو کەنغەری نەدیوە دەبێ دان بەوە دا بنێ، کە نەیدیوە، سەد حەیفە! بەڵام فیل، مەیمون و گیانداری دیکەی زۆر لە نزیکەوە دیوە، لە مەودایـەکی، کـە ئەگـەر دەسـتی درێـژ دەکـرد دەستی پێیان دەکەوت.

ئەو رۆژەی، کە بابی پێی گوت لەگەڵ خۆیدا دەیباتە شار لە خەنی و خۆشـیان نەیـدەزانی چیبکا لەبێ ئۆقرەیی و خەنی و خۆشیان لەناو پێستی خۆیدا نەدەحەواوە، بەڵام خراپییەکەی

ئەوە بوو، کە نەیدەوێرا لەمبارەوە قسە لەگەڵ کەس بکا. ئەگەر حاجی مـراد پێـی بزانیبـا چ فەرتەنەو بەزمێکی دەناوە و هات و هاواری لێ بڵند دەبوو، کـە بۆچـی بـاوکم سـوڵتان مـراد لەگەڵ خۆیدا دەباو من نایا؟ ئەو ساکە وەرە ئەو بەزمە خۆشکەوە[10] لەبەر ئەوەی لەکن ئـەو خوشحاڵی و چـاوەڕوانی لەرادەبـەدەری سـەفەری بـەیانی هەسـتی بـەگوناحێکی لەبەرانبـەر برایەکەی دەکرد، لەبەر ئەمە دڵی لێی دەدا، کە مەسەلەی سەفەرەکەی بەیانی بە براو خوشکە بچوکەکانی بڵێ، زۆری حەز دەکرد ئـەوی ژێـر بـەرێ بێنێتـە سـەر بـەرێ، بـەڵام بـاوکی و بەتایبەتیش دایکی پێیان گوتبوو نەکا لەم بارەوە فزەت لێوە بێ.

ئەوان وایان دانا بوو با کاتێك منداڵە بچوکەکان بەم باسە بزانن، کە ئـەو بـەرێ کـەوتبێ ئەوها باشترە، سوڵتان مراد زۆر بەسەختی زۆری لە خۆی کرد تا توانی دەمـی خـۆی بگـرێ و ئەم نهێنییە نەدرکێنێ، بەڵام لەم نهێنی پاراستنە هێندەی نەمابوو بتەرگێ بەڵام ئەو ئـەو رۆژە زێدە لە رۆژان ئەوەندە گوێڕایەڵ بوو، ئەوەندە میهرەبان و ئەوەندە بەهەست و پارێز بـوو، کە قەت شتی وای بە خۆوە نەدیتبوو.

هەموو کارێکی ئەنجام دەداو بەسەر هەموو ئیش و کارێك ڕادەگەیشت کندڕی گوێرەکـەی کردەوەو بۆ لەوەڕ بردیە شوێنێکی دیکە بـە سـتییەوە، هـەم خـاکی پەتاتـە جارەکـەی نـەرم کردەوە، هەم بۆ شوشـتنی جـل و جـۆرِ دەسـتەبەری دایکیشـی کـردو، ئالماتـای، بچـوکترین خوشکی، کە کەوتبوە ناو قوڕەوە شوشت و پـاکی کـردەوە و زۆر زۆر کـاری دیکەیشـی کـرد سەرتان نەهێشێنم ئەو رۆژە ئەوەندەی خۆرەتاند و کاریکرد کەتا دایکیشی خۆی پێنەگیرا و لە پێکەنینی داو سەری باداو لە حالێکدا، کە پێکەنینەکەی خۆی دەشاردەوە گوتی:

ـ ئەوە چی بووەو مانگای کێ لە گاران نەهاتۆتەوە، دەڵێی کراوی بە کەسێکی دیکە چەند باش دەبوو ئەگەر هەمیشە ئەوها دەبووی لە چاوی پیس بە دوور بێ چۆنە نەهێلێن بچیە شار، ها؟ بوویت بە بەردەستیکەرێکی زۆرباش.

ئەم قسەی دوایی هەروا کرد و لەدەمی هاتەدەر، بەڵام خۆی بە برژاندنی نان بـۆ رێگـاو ئامادەکردنی تۆیشە بەرەی دیکەوە خەریك کرد هەندێ کەرەی تواندەوەو بە شلی بـە مـەییوی لەناو بوتلێکی کرد.

---

(١٠) لە فارسیەوە دەڵێ: ئەوساکەر بێنەو شەرو دەعوای لێبارکە.

سەر لە ئێوارە هەموو خێزانەکە لە دەوری سەماوەردا نانی مادەیان بەسە رشێرو چایەوە خوارد ئەوان لە حەشەدا لەدەم جۆگەلە لە ژێر دار سێوێك دانیشتبوون منداڵەکان دەوریان لە باوکیان دابوو، لایەکی حاجی مراد و لایەکەی دیکەی کچۆڵەکان لێی دانیشتبوون دایکی چایی تێدەکرد و سوڵتان مرادیش پیاڵە چایەکانی دەدا دەست ئەوانی دیکەو خەڵوزی لە لولەی سەماوەر دەکرد، ئەو هەموو ئەو کارانەی بەرەزای خۆی ئەنجام دەدا و هەموو دەم هەر لەسەر خەیاڵی سەفەرەکەی بەیانی دا بوو، کە بەیانی لەناو شار دەخولێتەوەو سیاحەت دەکا باوکی یەك دووجاران چاوی لێداگرت جگە لەمەش بە سوعبەت و گاڵتە لە حاڵێکدا، کە چای فڕ دەکرد بە کوریژگە بچووکەکەی گوت:

ـ حاجیلەکەم یاڵ رەشت رامکرد یان نا؟

حاجی مراد بە گلەیی و نارازییەوە گوتی:

ـ نا بابەگیان، یاڵ رەش زۆر ناجسنە وەك تولەسەگ بەدوامدا غار دەدا.

من ئاوی دەدەم و ئالیکی دەدەمێ جارێکیان بە دوامدا هاتە قوتابخانە و لەبەر پەنجەرە وەستاو چاوەڕێیکرد تا من لەکاتی زەنگ لێدان و پشودا دێمە دەرەوە، هەموو پۆلەکە دیتیان بەڵام ناهێڵێ سواریبم یەکسەر هەڵم دەدا و ئێستا جووتانیش دەهاوێ.

ـ کەسیش نییە، کە یارمەتیت بدا تا فێرە سواری بکەی.

لەم سەرو بەندانەدا سوڵتان مراد ئامادەیی خۆی پیشانداو گوتی:

ـ حاجیلەکە من ئەم کارە دەکەم و من خۆم بۆ سواری رایدەهێنم و حاجی مراد لە جێگای خۆی رەپێ بوو و هاواری کرد:

ـ دەیاڵلا دەی، بابرۆین.

دایکی گوتی! ئارام بگرە، لەجێی خۆت دانیشەوە نەجولێیەوە.

یەکەم جار وەك پیاوان چایەکەتان بخۆنەوە لە دواییدا بڕۆن. کەرە رەش لە دەستان هەڵنایە[11] قسەکردن لەسەر جاشولکە دووساڵیەکە بۆ حاجی مراد باسێکی زۆر خۆشبوو، بەهاری ئەوساڵە بوو نورگزی خاڵۆیان، ئەو جاشولکەی دابووە منداڵەکان، جاشولکەکە سەر لە هاوێنی چاك سوورا بوو و گەورە ببوو کاتی ئەو هاتبوو کورتانی لێبنرێ و سواری بن و کاری پێبکەن چونکە لەهەموو ماڵێکی گوندەکە (ئائیلەکە) وولاغ پێویست دەبێ و بۆ باراش بردنە

---

(١١) ئەمە لە ئەلمانیەکە هەبوو لە فارسیەکەدا نەبوو.

ئاش و هێنانی دار و چیلکە و وردەواڵە شتێکی باشە هەر لەبەر ئەمەش بوو نورگزی خاڵی منداڵەکان ئەو جاشولکەی دابوونێ سەرەنجام واهات کەهەر لە ڕۆژی یەکەمەوە حاجی مراد بوو بە خاوەنی ئەم کوریژگە بەرعەکس و پر سەروسەداو هات و باتە ئەوەندە ئاگای لەو گوێدرێژە دەبوو، کە کەس نەیدەوێرا لێی نزیك بێتەوە، کە کەسێك، کە لێی نزیك دەبۆوە یەکسەر حاجی مراد لێی دەقیڕاند و تێیڕا دەخوڕی (دەست بۆ جاشولکەکە نەبەن). من خۆم ئاو و ئالیکی دەدەم تا جارێکیان لەسەر ئەمە، تێکیان هەڵداو دایکیان چاوی لە کوڕە گەورەکەی سوورکردەوە، هەر لەبەر ئەوەی لە برا بچوکەکەی دابوو لەو کاتەوە سوڵتان مراد لالووت بوو. ئەوکاتەی، کە وەختی هێنانە بەرباری جاشولکەکە بۆ سوارکردن و بارلێنانی داهات خۆی لەم کارە لە گێلی داو گوتی ئێستاکە جاشولکەکە لە هی تۆیە خۆشت رامی بکە لەبەر من مە پارێوە و ئەسڵەن ئەمە کاری من نییە هەرچەندەی، کە سوڵتان مراد لەم کارە لێهاتوو بوو ئەو لەمنداڵیەوە خوی بەم کارەوە گرتبوو کارەکەی ئاسان بەدەستەوە دەهات و وردەی کارەکەی بەدەستەوە بوو چێژی لێدەبینی و حەزی دەکرد ئاژەڵی کێوی کەوی بکا ئەم کارە وەك زۆرانبازیەکی ئەوتۆ وابوو تاکێهەلایان بەسەر ئەویدیاندا سەرکەوێ.

ئەو هەمیشە هەموو جوانو، جوانەگاو جاشە لەرەکانی رام دەکرد، لە راستیدا کوریژگە چوستو چاپوکەکان ئاژەڵە تازە منداڵەکان بەکار دەستە مۆدەکەن، لەبەر ئەوەی سەنگی مرۆڤی بەتەمەن رێگای ئەم کارە نادا ئەمە بوو، کە خەڵکی بەریزەوە دەهاتنە لای سوڵتان مراد و دەیانگوت: (سوڵتان مراد، کوڕی خۆم، هەرکە دەرفەتێکت لێهەڵکەوت گوێرەکەکەمان رام بکە)، یان (سوڵتانکە[١٢]: قوربانی دەستت بم، ئەم جاشولکە بە زەڕەزەڕەی ئێمە عاقل بکە ناهێڵێ مێشو مەگەزیش بەسەر شانییەوە بنیشێ، قەپاڵ دەگرێ، جووتە دەهاوێ، تۆ نەبی کەس دەروەستی نایە... . ).

سوڵتان مراد، کە بەم ناوبانگ و شانازیەوە بەهرەمەند بوو، بەڵام گوێی بە تکای براکەی نەدا و تاکو ئەو کاتەش، کە حاجی مراد یەك دووجاران لەسەر پشتی جاشولکە ئەزیزەکەی بەر بۆوە و ناوچەوانی شین و مۆر بۆوە و هەڵتۆقی بەتیز و گاڵتەجارییەو پێی گوت:

ـ تۆ هێشتا دەبێ ئازاری پێوەبکێشی.

(١٢) سوڵتانکە وەك عومەرکە، حەمەدکە، عەبەکە، نەوەکە: بچووك کردنەوەیە بۆ خۆشەویستی.

ئێستا روون دەبێتەوە، کە زۆر خراپ رەفتار لەگەڵ حاجی مـراد داکـردووە سـوڵتان مـراد تەنیا کاتێ لەم هەڵەیەی بە ئاگاهاتەوە، کە باوکی بە کینایەتەوە پێـی گـوت لـە راستیشـدا عـەجەب ئەحمەقێك بووە، کە بەو جۆرە نایابە حسێبی لەگەڵ باوکیدا پاك دەکردەوەو ئێسـتاکە دەیەوێ بۆ شار سەفەر بکا، سەفەرێکی وا، کە براکـەی هـیچ ئاگادارییـەکی لـەبارەوە نییـە، بەجۆرێکی وا ویژدانی نارەحەت بووە و پەشیمانی دایگرتووە، کـە ئامادەیـە داوای لێبـوردنی لێبکا، دوای چایی خواردنەوە لەگەڵ باوکیدا چوونە مێرگەکـەی ئەوبـەری باغچـەو یەکـەمجار هەموو بەردەکانی ئەو دەورو بەرەیان کۆکردەوەو لە دواییدا دووریان خستنەوە لەدواییدا کاکۆل و یاڵ و رەش، یەعنی جاشولکەکەی (حاجی مراد جاشولکەکەی بەم ناوەوە بانگ دەکرد). یاڵ رەشیان لغاوکرد.

باوکیان گۆیەکانی کاکۆڵ رەشی بـە هـەردوو دەسـتان گـرت و رایگـرت و سـوڵتان مـراد بەزرینگیەوە لغاو قەراسەی لەمل کرد، ئینجا کەمەر بەندەی پانتۆلەکەی نـەختێ تونـدترکرد چونکە کارێکی هێندە ئاسانی لەبەر نەبوو ئینجا ئێستا نمایشی سـێرك و دەسـتپێکرد، یـاڵ رەشی کەماوەیەك بەسەرپەرشتی حاجی مراد ژیانێکی نایاب و خۆشی بەسەر دەبرد چەمووش ببوو، هەر لەبەر ئەم هۆیەش یەکسەر و یەکڕاست دەستی بەسەر کێشی و جووتـە هاویشـتن و بەم لاو بەولادا ڕاکردن کرد، گوێدرێژەکە دەیزانی چۆن سـوار لەسەرپشـتی خـۆی هـەڵبراو بـە ناوەندی عاردی دابدا بەڵام ئەم سوارەیان ئەو سوارەی پێشوو (حاجی مـراد) نـەبوو، لەگـەڵ ئەمەشدا حاجی مرادی هەڵدەداو دەیخست، بەڵام هەموو جارێك دەرلەحاز گورج قیت دەبۆوە و خۆی هەڵدەداوە سەرپشتی جاشولکەکە هەرچەندە هـەڵی دەتلیزانـد بـەڵام لـەبای غارێـدا لەسەر سك خۆی بە پشتی کەرەکەوە نووساندو قاچی لەسەر کەفەڵی ئاوادەکرد و دادەنیشـت و دیسان کەرە هاروهاجی دەکـرد، دیسـان دەکەوتـەوەو ئـەو جـارێکی دیکـەش هـەوڵی خـۆی دەداوە...

ئەم کارانە لەلایەن سوڵتان مرادەوە بە چاپوکی و بەشێوەیەکی زەوقانییـەوە ئـەنجام دەدرا، هەموو مەسەلەکەش لەوەدایە کەدەبێ لە چۆنییەتی کەوتنەکەدا شـارەزابیی لەبەرچـی دەڵـێن مرۆڤ لەکاتی پەڕینی لەسەر ووڵاغدا زێتر لە بەرزەو ئەسپ و ووشتر زەدە دەبـێ؟ لـە کاتێکـدا وادێتە بەرچاوان دەبێ بەپێچەوانەوە بێ نهێنی مەسەلەکە لەمەدایە، کە کـاتی کـەوتن دەبـێ بەسەر چوار پەلاندا بکەوی بڵندی ئەسپ و بەتایبەتی هی ووشتر دەرفەتی ئەم کارە بـۆ مـرۆڤ

دەرەخسێنێ سواری بێ ئەزموون لەسەر وولاغ وەك جلۆكە دەكەوێ و پێڕاناگا ئەم شێوە كەوتنە بەكاربێنێ.

سولْتان مراد هەر بە ئەزموونی خۆی ئەمەی دەزانی و نەدەبوو لەم لایەنەوە لێی نیگەران بی قاو قیژو شادی و پێكەنین و هاوارهاوار دەستیپێكرد، باوكە لە پێكەنینان زگی خۆی گرتبوو ئەوەندەی لە قاقای پێكەنین دا تا چاوەكانی پڕ ئاو بوون كوڕو كاڵەكە، كە گوێیان لە قاوقیژ بوو هورژمیان بۆ ئەوێ هێنا، یەكێكیان سەگێكی هەبوو ئەم سەگە عەقلی وابڕی كەلەم بێنەو بەرەیە بەشداری بكا.

ئەمە بوو، كە بە وەڕەوەڕ بەدوای جاشولكەكە كەوت جاشولكەكەیش لە ترسی خۆی بە جریتە بازییەوە خێراتر غاری دا، بەڵام سولْتان مراد سوارچاكی خۆی نیشان دەدا و لەبای غارێدا خۆی لەسەر كاكۆڵ رەش هەڵدەدا خوارێ بە فرتكەیەك خۆی هەڵدەداوە سەرپشتی ئەمەش خۆشیەكی پڕ لە تاسەی خستبووە دڵی منداڵەكانەوە.

بەر لە جەنگ سوارەكانی ئەندامی ئەنجوومەنی هاوكاری و بەرگریكردن، لە چیمەن شینكاییەكەی تەنیشت تەلاری ئەنجومەنی گوندەكەیاندا بە هەمان تەرز ئەسپ سواریان دەكرد، ئەمانە سوارەی (ئائیل)بوون و دوای تەواوبوونی كاری رۆژانەیان ئەسپ سواریان دەكرد. لە كاتی چوارناڵەدا بە شمشێرەكانیان نەمامیان دەپەڕاند و لەسەر زینەكەوە فرتكێكیان بۆ خوارەوە لێدەدا و خۆیان دەهاویشتەوە سەر ئەسپەكانیان. هەندێكیان نیشانەی سوارچاكیان وەرگرتبوو. نیشانەی زریزەدار، كە بە سنجاق و دەرزیلان بە بەرۆكەوە دەكرا، زۆر جوان بوون، منداڵەكان حەسرەتیان هەڵدەكێشا و هەرا هەرایان دەكرد تا تەماشای سوارەكانی ئەندامی ئەنجومەنی هاوكاری و بەرگریكردن بكەن.

ئێستا ئەوانە لە كوێن؟ بەسواری ئەسپەوەن یان لەناو سەنگەرانن؟ دەڵێن ئێستا لەجەنگدا چیدی ئەسكەری سوارە بەكار ناهێنن...

سولْتان مراد تەماشای ئەودیوی پەنجەرەی كرد و بیری كردەوە هەرچەندە بەسواری ئەسپەوە رەق دەبنەوە بەڵام سەرما كار لە تانگ ناكا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەر ئەسپ باشترە!

ئەو حەلە چەندەی بەكەیف دەبوو! بە یال رەش خێرا كەوی و گوێڕایەڵ بوو و تێگەیشت، داوای چی لێدەكرێ: بە ئاسایی بڕوا، خێرا بڕوا، بگەڕێتەوە یان بەلای راستدا بڕوا... .

سولْتان مراد بانگی براكەی كردو گوتی:

ـ ئێستا وەرە سواربەو هەموو شتێك بە دڵی تۆیە و تەواوە.

حاجی مراد له باغری و بەخۆنازینان سوور هەڵگەڕاو بە پاژنەکانی لە لاتەنیشـەکانی یـاڵ ڕەشی سرەواند و بـەم لاو بـەولادا کـەمێکی لێخـوڕی ئێسـتا هـەموویان بـە چـاوی خۆیـان دیتبوویان، کە ئەو چ کاکێکی لێهاتووی هەیە، چۆن دەبێ شانازی بەم حاڵەوە نەکەی! ؟ .

هێندەی نەبردبوو هەوا تاریك داهـاتبوو، هـەموویان مانـدو و شـەکەت و ڕازی بـۆ مـاڵ گەرانەوە. حاجی مراد بە سواری گوێدرێژەکەوە چۆوە ناو حەوشـەی مـاڵێ تـا خـۆی پێشـانی دایکی بدا.

ئەو یەکسەر بەلا داهات و خەو بردیەوەو هەستی بە مەسەلەکە نـەکرد بـەڵام ، سـوڵتان مراد خەو نەیدەبردەوەو بیری دەکردەوە، کە بەیانی چۆن چۆنی بۆ شار دەچێ و لەوێ چ دەبینێ و چ شتانێك چاوەڕێی ئەون. کە تازە خەو دەیبردەوە گوێی لێبوو، کە داك و بابی لەسـەرەخۆ پێکەوە دەکەن.

باوکە گوتی: من دەمویست ئەوەی دیکەش لەگەڵ خۆمدا ببەم پێکەوە بۆیان خۆشترە... . جێی داخە، کە لە ناو عەرەبانەکە جێگا نییە دەبێ لەسەر عارەبانە لەو پێشی پێشەوە لـەژێر بەرمیلەکە دانیشێ ڕێگاش دوورو درێژەو منداڵەکە خەو دەیباتەوەو دەکەوێتە بن تایەکانەوە.

دایکە ترساو لەژێر لێوەوە گوتی:

ـ ئەم قسانە مەکە، خوا نەکا، بەهیچ جۆرێ بیر لە بردنـی ئـەو مەکـەوە پێویسـت ناکـا جارێکی دیکە ئەو ببە، لێگەڕێ با کەمێك هەراشتر بێ. تـۆ چـاوێکت بکـە دوو و ئاگـاداری ئەمەیان بە. وا مەزانە گەورەیە، هێشتا ماویەتی گەورەبێ.

سولڵتان مراد بە دڵێکی خۆشەوە دەنووست. بیستنی قسە لەسەرەخۆکانی دایـك و بـابی و ئەو دالغەی، کە بەیانی سەحەران لەگەڵ باوکی دەکەونە ڕێگا، زۆر سازگار و خۆش بوو. لەناو نوێندا بەدڵێکی، کە لە خۆشیان خـەریك بـوو بوەسـتێ، هەسـتی بـە توانایـەکی لـە وەسـف نەهاتووی فڕین کرد سەیر بوو لە کوێ فێری فڕین ببوو مرۆڤ دەتوانێ بڕوا، ڕابکا، مەلە بکـا، بەڵام ئەو دەفڕی، بەڵام نەك کت و مت وەك مەلان مەل لەشـەقەی بـاڵ دەدەن ئـەو تـەنیا باڵەکانی لێك کردنەوەو سەری پەنجـەی دەسـتەکانی جووڵانـدەوەو بـە ئـازادی کەوتـە فـڕین. نەیدەزانی لەدنیای بێدەنگ و پێکەنیناوی و پان و بەریندا لە کوێوە بـۆ کـوێ دەفـڕێ؟ ئەمـە فڕینی رۆحی بوو لەخەودا گەورە دەبوو.

ئەو حەلەی باوکی دەستێکی لە لاشانیداو لەسەرخۆ لەبنا گوێی گوتی:

ـ سولّتان مراد هەلّسە دەبیّ برِۆین، لەخەو هەلّساو بەرلـەوەی لـەناو جیّگـا بیّتـەدەر بـۆ چرکەیەك هەستی کرد، کە شەپۆلیّك لە میهرەبانی و ئەمەکداری لەمەرِ باوکیەوە بەسـەراپای لەشیدا هات، میهرەبانی و ئەمەکداریەکی ئەوتۆ، کە بـە خشـانی سمیّلّـە زوورەکـانی بـاوکی بەلاجانگیداو هەروەها بە بیستنی قسەکانی لە میّشکدا بووژایـەوە، هیّشـتا نەیـدەزانی، کـە رۆژگاریّ، بەخەم و دەرد، لەمەرِ ئەم سمیّلّ بەرکەوتنەو قسەکانی بەبیر خۆی دەهیّنیّتـەوە، کـە گوتی: (سولّتان مراد هەلّسە دەبیّ برِۆین).

دایکە دەمیّك بوو هەلّسابوو ئەو کراسـی خـاویّن و کـلاّوی سـەوزو فـەراحی وەك کـلاّوی سەرۆکان، کە باوکی سولّتان مراد پارەکە لـە (کـەنالّی چـو)وەوە هیّنـابووی و هـەروەها ئـەو پۆتینانەی شاردبوونیەوە و ئەویش هەر باوکی لە کەنالّەوە هیّنابووی دایە دەستی کورِەکـەی و گوتی:

ـ پۆتینەکانت لەپیّ بکە، بزانە تەسك نین؟

سولّتان مراد گوتی:

ـ نا، تەنگ نین.

هەرچەندەی کەمیّك تەسك بوون بەلاّم هەروا دەبوو بەپیّم دەکەن و دادەکەنریّن.

ئەو کاتەی ئەوان خواحافیزیان لە دایکی کرد بە سواری عارەبانەوە لە حەوشە وەدەرکەوتن و وەختیّ عارەبانە نەوت کیّشەکە بەتەق و هۆرِ بەرووبارە چەوەلاّنە گەورەکەدا تیّپـەرِی، دلّـی حاجی مراد داخورپاو تەکانیّکی داو لە خۆشحالّی و پریشکە پریشکی ساردی، کە لەژیّر پیّـی ئەسپەکان بەو داپرِژان خۆی نوشتاندەوەو تیّگەیشت، کە ئەو خـەون نییـە بـەلّکو بەخەبـەرە و بەراستی بەرەو شار دەچیّ.

سپیّدە دەمیّکی هاوینی وەك هەنگوین روونـاك دادەهـات. خـۆر هیّشـتا لـە جیّگایـەکی دووری پشت کیّوە پرِ بەفرەکانەوە خـۆی مـەلاّس دابـوو، بـەلاّم بەرەبـەرە بلّنـد دەبـوو وەك جوجەلّەیەکی، کە سەری لە قەپیّلك بجووقیّنیّ و دەنـووك لـە دیـوای قەپیّکەکـەی دا ئامـادە دەبوو، کە لە هیّکرا بیّتە دەرو لە پشت کیّوانەوە تیشکان پەخشان بکا.

لەو کاتەدا جادەکە هیّمن بوو. ساردو تەرِو تازە دەهاتە بەر چاوان. سەد مخابن کـە هـیچ یەکیّکی لە منداڵەکان نەدیت تا ببینن کە ئەو چۆن لەگەلّ باوکی لـە (ئائیل)دەرچـوو، تـەنیا سەگە خەوالّوەکان لە گۆشەو کەناران پەیدا دەبوون بەبیسـتنی دەنگـی چـەرخەکانی عارەبانـە کەوتنە وەرِین و حەپە حەپ... .

جاده زورگاویەکە بەرەو دەشت و چۆلی و زنجیرە چیایەکی کورت و بنەوشەیی و تاریك درێژ دەبۆوە، ئەویێ کەوتبووە پشت ئەو چیا دوورە دەستانەی جمبۆلەوە، کە ڕێگای ئەوان بـەرەو لای ئەویێ بوو.

ئەسپە تێرەکان ئازایانەو بە چوار ناڵەی کورت و هەماهەنگ دەبەزین و وادەهاتە بەرچـاو، کە ئاگایان لە زین و نیری عارەبانە نەبوو، بۆ خۆیان رادەکەن و وەك عادەتی هەموو ئەسـپێك دەیانپڕماند و کاکۆڵیان بەسەر چاوەکانیاندا دەهات و دەچوو. ڕێگاکە بۆ ئەوان زۆر ئاشنا بوو و چەندەمین جاریان بوو بەم ڕێگایەدا هاتوچۆیان دەکرد. خاوەن عارەبانـە لـە جێگـای خۆیـدا دانیشتبوو و ڕێشمەکەی لەدەستدا بوو. ئەو کوڕیژگەیەشی، کە لـە کـەناری ئـەو دانیشـتبوو لەبەر چاوی ئەسپەکاندا خۆیی بوو و ڕێگای لەراکێشانی عارەبانەکە نەدەگرت. . . .

ئەوان بەهەوایەکی خۆش لە جوڵەدا بوون و عارەبانەکەش وەك هەموو عارەبانـەکانی دنیـا لە لێکخشانی وشك و هۆی دیکەوە تەق و هۆڕیـان لـەم نـاوەدا نـابۆوە. لـەم سـەروبەندانەدا خۆریش لە لاپاڵێکی چیاکان گزنگی دا. تیشك و گەرما هێمن و نەرم لەگەڵ شـەپۆلی شـنەی بادا بەسەر ئەستۆی ئارەق کردوی ئەسپەکاندا هەڵیدەکرد.

ئێستا (چاپدار)شین خۆی دەنواند و چونتور ڕەنگی پتر شێ یەکی سپات و ڕووناکتر دەبـوو، ڕووناکی و گەرما بە کولمە دەرپەڕیوە برۆنزییەکانی باوکیـەوە نووسـا بـوون. لۆچـە رەقـەکانی دەوروبەر چاوەکانی ئەویان زیاتر بـە قوڵـدا بردبـوو. دەسـتەکانی، کـە لغاوەکـەیان گرتبـوو، گەورەتر و پڕ ڕەگ و پیر تر دەهاتنە بەرچاوان. ڕووناکی و گەرما ڕێگاکەیان پـڕ کردبـوو. وەك بریسکەی کارەبا لەژێر سمی ئەسپەکاندا دەردەپەڕین(١٣).

تیشك و گەرما دزەیان دەکردە دوو تویێ لەش و کونی چـاوەکانەوە. ڕوونـاکی و گـەرما گیانیان دەهێنایەوە بەر هەرشتێکی، کە لەسەر زەمیندا هەیە. ئەو ڕۆژە سەر لەبەیانی بـەدەم ڕێگاوە ورەی سوڵتان مراد شاد و ئازاد بوو.

باوکی بە گاڵتەوە گوتی:

ـ ئەریێ، لەخەو هەڵسای؟

کوڕەکە وەڵامی داوە گوتی:

ـ زۆر دەمێکە.

---

(١٣) ئەمەم لە ئەلمانیەکەوە وەرگرتووە.

ـ ئێستاکە بێدار بوویتەوە کەواتە بگرە. باوکە لغاوی ئەسپەکانی بەو سپارد. سوڵتان مراد لەرووی ئەمەگدارانە پێکەنی ئەو بەبێ سەبرو ئارامی چاوەڕێی ئەوەی دەکرد. دەکرا خۆیشی ئەم داخوازیە بکا بەڵام باشتر بوو باوکی ئەمە بە پێویست بزانێ. لێرە لەسەفەری دوور نەك لە جێگایەکی دیکە پشتی پێبەستێ و باوەڕی پێبکاو لغاوی بداتە دەست، ئەسپەکان هەستیان کرد، کە لێخوڕینیان دراوەتە دەستێکی دیکەو لەبەر ئەوە بە نارەزاییەوە گوێیەکانیان شۆڕ کردەوە و لەکاتی غاردانیدا گازیان لە یەکدی گرت. رێك وەك ئەوەی بڕیاریاندا بێ لە لاوازی رابەرەکەیان بغەزرن، بەڵام یەکسەر سوڵتان مراد دەست و قامی خۆی نیشان داو بە تەکانێکی لغاوەکە تێی ڕا خوڕین و هاواری کرد:

ـ ئاهای، ئارامبن، ئەگەر نا!

ئەگەر مرۆڤ تەنیا لەو ئان و ساتەی تێیدابە خۆشبەخت بێ، نە لەرابردوو و نە لەداهاتوودا پێویستی نییە. دە ئەوەتا سوڵتان مراد لەم سەفەرەدا دەیچێژێ و پڕ بەدڵ هەستی پێدەکا تا دەقەیەکێش نەبوو، کە مگێزی لە شتێك تێکچێ. ئەو لە تەنیشت باوکی هەستی بە لێوەشاوەیی تەواو دەکرد و بە درێژایی رێگاکە ئەم هەستەی بەری نەدا تەقە تەقی ئەم عارەبانەی نەوتە رەنگ بوو کەسێکی دیکەی شێت دەکرد، بەڵام بۆ ئەو ئەم تەق و هۆڕە ئاوازێکی شادی بەخش بوو، تۆز و خۆڵێکی، کە لەژێر عارەبانە لەدواوە بڵند دەبوو، رێگایەکی چەرخی عارەبانەکە بەسەریدا دەخولانەوە. ئەسپەکان کەبە سمەکانیان و هاوزەمان و هاوئاهەنگ شونیان لە جادەدا بەجێدەهێشت، ئەسباب و ئالاتە زەریفەکانیان، کە بۆنی ئارەقەو شەمێیان[١٤] دەدا، گەواڵە هەوری سپی و سووك، کە بەسەر سەریانەو لەو پەڕەگەی ئاسماندا کۆچیان دەکرد، گیاو لەوەڕی هەڵساوی دەوروبەر، کە هێشتا وشك نەببۆوەو بە رەنگی زەرد سوورێکی تۆخ و بنەوشەیی بوون، رووبار و جۆگەلەکان، کە ئاویان بەسەر رێگایانەوە وەرکردبوو، سوارو عارەبانەکانی، کە بەرەو روویان دەهاتن، پەرەسێلکەکانی دەوروبەری رێگا بەخێرایی لە دواوەو لەپێشەوە دەفڕین و جاری وا دەبوو هێندەیان نەدەما بەر قەپۆزی ئەسپەکان بکەون، ئەوانە هەموویان خۆشبەختی و ئەوپەڕی جوانیان بۆ سوڵتان مراد دەستەبەر دەکرد، بەڵام ئەو لەم بارەوە بیرێکی نەدەکردەوە، چونکە خۆشبەختی لەئارادایە، بیری

(١٤) شەمێ: مۆم.

لێناکەنەوە. ئەو هەستی دەکرد، کە جیهان وا دروست بوە، کە لێی جوانتر نابێ و باوکیشی هەر بەو جۆرەیە، کە لێی باشتر نابێ هەبێ.

تا بەوە دەگا، کە مەل و باڵندە زەرد و سەر رەشەکانی دەشت و دەری سەرانسەری رێگا لەناو پنجك و دڕیان بیهۆدە بەو شێوەی، کە فێر بوون وەك یەك نەخوێنن، ئەوان دەزانن بۆچ کەسێك دەخوێنن و دەزانن، کە سوڵتان مراد ئەوانی چەند خۆشدەوێ. ئەم مەلانە ناویان سارایگیرە (ساری۔ رەنگ زەرد، ئیگیر: ئەسپ) وە لەبەر ئەوە ئەوها ناودەنرێن، کە لە سەرانسەری ژیاندا بەفیکەو خوێندنیان ئەسپی زەرد تاو دەدەن: (نوچ، نوچ سارایگیرا. نوچ، نوچ، سارایگیرا. ) سارایگیرا پەلەوەری زۆر باشن، بەڵام دیارە، کە ئەوان بۆ هەر زمانەی بەجۆرێکی تایبەتی دەخوێنن. رۆژیکیان کرێکارێکی (ئاپارانجی) سینەما کە گەنجێکی قۆزی روس بوو، هاتە ئائیل. سوڵتان مراد بەدەوروبەری ئەودا دەخولاوە و لە هەڵگرتنی قوتوی فیلمان هاریکاری دەکرد. لەباتیان کە شەو داهات یەکەم کەس، کە سووڕاندنی، دینەمۆی درایە دەست سوڵتان مراد بوو، لە دینەمۆدا کارەبا بەرهەم دەهێنرا بە کارەبا گلۆپەکان دادەگیرسان. لە گلۆپەکانەوە رووناکی بەر دیواری شاشەی سپی سینەما دەکەوت و لەوێشدا وێنەی زیندوو پەیدا دەبوون.

جارێکیان کرێکارەکە کەمێك گوێی بۆ خوێندنی سارایگیر هەڵخست و پرسی:

ـ ئەمە چ مەلێکە لەپشت دیوارەوە دەخوێنی؟

ـ سوڵتان مراد وەڵامی داوە:

ـ ئەمە سارایگیرە.

ـ چ دەخوێنی؟

ـ نوچ ـ نوچ ـ سارایگیر.

ـ مانای چیە؟

ـ نازانم، دەبێ بە روسی مانای (هین هین ئەسپی رەنگ زەرد. )بدا.

ـ یەکەم ئەسپی زەردرەنگ نییە. باوا دابنێن هەبێ بۆچی دەخوێنن (نوچ، نوچ، سارایگیر! )؟

ـ چونکە وادێتە بەرچاوی ئەم مەلە، کە سوارەی سارایگیر دەچێتە زەماوەند و هەرچەندەی دەڕوا و ناگاتە مراز، لەبەر ئەمەیە، کە ئەو بەردەوام هەر تاو دەدا و دەڵێ(نوچ، نوچ، سارایگیر. )

ـ بەڵام  من وام بیستوە، کە گوایە سارایگێر لە بازاڕ یاریی کاغەزی کردوەو هێندەی نەمابوو سێ رۆبل بباتەوە بەڵام  نەیبردۆتەوە لەبەر ئەمەیە، کە ئەوها دەخوێنێ: (هیچ، هیچ، سێ رۆبل ببەمەوە! ) و تا ئەوکاتەی ئەم سێ رۆبلە نەباتەوە هەر ئەو ئاوازە دەخوێنێ.

ـ باشەکەی سێ رۆبل دەباتەوە؟

ـ هیچ کاتێ نایباتەوە، هەر بەمجۆرە، کە هیچ کاتێك ناگاتە شوێنی زەماوەندەکە.

ـ سەیرە.

لەراستیشدا سارایگێر لە رواڵەتدا مەلێکی هێندە بەرچاو نییە کەچی ئەو هەموو ناوبانگەی هەیە.

سارایگێرەکان لەسەرانسەر و بەدرێژایی رێگادا دەخوێنن و سوڵتان مراد پێیان پێدەکەنێ:

ـ با پێکەوە بچینە بازاڕ و سێ رۆبل ببەینەوە!

سارایگێرەکان بەهەمان شێوە فیك و هۆڕ دەخوێنن (نوچ، نوچ، سارایگێر) و جارێکیش بەم شێوە (هیچ، هیچ، سێ رۆبل ببەینەوە!)

سوڵتان مراد پەلەی بوو تا زووتر بگاتە شار. خۆر دووگەز بەسەر کێوانەوە بڵند ببوو، سوڵتان مراد دیسانەوە ئەسپەکانی تاو دا.

ـ نوچ، نوچ، سارایگێرـ ئەو ئەمەی لەگەڵ چاپدار بوو.

نوچ، نوچ، تورایگێر! ـ ئەمەشی لەگەڵ چونتور بوو.

باوکی قرەقرێکی بەسەردا کرد و گوتی:

ـ تۆ زۆر تاویان مەدە، ئەسپەکان خۆیان دەزانن ئەوان خۆیان دەزانن و ئاگایشیان لە خۆیانە.

ـ بابە گیان کامەیان رەسەنترو چاکترە، چاپدار یا چونتور؟

ـ هەردووکیان باشن. هەم لە رۆیشتن و هەم لەلایەنی هێزەوە، وەك ماشێن کار دەکەن تەنیا پێویستە لە کاتی خۆیاندا ئالیك بدرێن و چاکیش ئالیك بدرێن و زین و قایش و قروشی ئەسبابیان بەردەوام چاودێری بکرێ، بەم شێوەیە دەکرێ لە سەلامەتیان دڵنیا بیت. ئەوان ئەسپی ئەوتۆن جێگای دڵنیایی و پشت پێبەستنن. پارەکە لە کەناڵی (چو) لە ناوچەیەکی زەلکاو کارمان دەکرد. عەرەبانەکان بەبارەوە تا ناوەڕاستی چەرخەکانی لە قوڕو لیتەدا دەچوونە خوارێ و دەچەقین. ئەوکاتە عارەبانچییەکان دەهاتن و داوای یارمەتیان دەکرد نەدەکرا. روویان لێوەرگێڕی و جێیان بهێڵی. چاپدارو چونتورم دەبردو و لەعارەبانە

چەقیوەکەمان دەبەستەوە ـ ئێمە ئەوان بە گیانلەبەر دادەنێن و لە کاتێکدا عاقڵن و تێدەگەن، کە ئێمە لە خۆڕا نییە ئەوان لەعارەبانەی دیکەوە نابەستین و دەبێ هاریکاریمان بکەن. من هێندەم قامچی بەکار نەدەهێنا و تەنیا دەنگم دەدان و هەرئەوەندە، تەنیا ئەسبابی عارەبانە نەبچڕابان ئەگینا ئەوان بە خزینی سەر چۆکانیش با عارەبانەکەیان لە چاڵەکە دەردەهێنا. لەوێ لە کەناڵی (چو) هەموو ئاگایان لە ئەسپەکانی من هەیە و ئێرەییان پێدەبردم و دەیانگوت: (بەگبای: تۆ بەختت هەڵساوە) ڕەنگە بەختیشم بووبێ بەڵام دەبێ زۆر چاودێری ئەسپەکان بکرێ، ئەوکاتە بەختیش یار دەبێ.

چاپدار و چونتور و چاپووك و زرنگ بەهەمان شێوە چوارناڵە بەرەو پێش دەچون، بە جۆرێکی وا وەك بڵێی ئەسڵەن گوێیان لەو قسانە نەبوو، کە لەبارەی ئەوانەوە دەیانکرد. ئەوان بەگیانی شەلاڵی ئارەقەوە بۆ خۆیان لەبای غارێدا بوون و بە تەکاندانی سەرو کەللەیان مێشو مەگەزی ڕێگایان لەخۆیان دەردەکرد.

سوڵتان مراد لەباوکی پرسی!

ـ بابە، کامەیان بەتەمەنترە، چاپدار یا چونتور؟

ـ چونتور و سێ ساڵ بەتەمەنترە من دەزانم، کە خەریکە کەمێك پیر دەبێ و توانای کەمتر دەبێتەوە، بەڵام چاپدار لە هەرەتی تواناو بڕشتیدایەو تۆکمەو گورج و بەغارە، لەگەڵ ئەودا دەتوانێ پێش لە زۆر ئەسپان ببڕیەوە، پێشینان ئەم جۆرە ئەسپانەیان بە ئەسپی سواری ناو دەبرد.

سوڵتان مراد لە خەسڵەتەکانی چاپدار چێژی بینی، جارانیش هەر زێتر کەیفی پێدەهات جسنەکەی نائاسایی یەعنی شتێکی جنجر بوو، جگە لەمە ئەم ئەسپە یاختەو بەدخو نەبوو جوان و بەهێز بوو.

سوڵتان مراد بەباوکی گوت:

ـ من چاپدار پەسند دەکەم، چونتور تووڕەو تۆسنە هەر بەتی چاوانەوە سەیری مرۆڤ دەکا.

باوکە پێکەنی و گوتی:

ـ شەڕەنگێزنییە، بەهۆشەو حەزناکا بێهودە نارحەتی بکەن، دوای کەمێك بێدەنگی گوتی: هەردووکیان باشن.

سوڵتان مراد لەگەڵ قسەکانی بابی کۆك بوو و بەدەم ئەسپ لێخوڕینەوە دووبارە گوتیەوە:

ـ هەردووکیان باشن.

باوکە دوای کەمێك گوتی:

ـ باشە، ڕێشمەکە کەمێك توندکە و عەرەبانەکە ڕاگرە و هێمن و بەپارێزەوە فیکەو شاوری کێشا، ئەسپەکان دەیانەوێ بمیزن و بەڵام ناتوانن بیڵێن دەبێ ئاگادار بی.

لەراستیشدا هەردوو ئەسپ لەناو جادەکە شوڕە سوڕی میزیـان دەسـت پێکـردو میزێکـی کەفاوی لەناو جادەکە جۆگەلەی بەست و تۆزو خۆڵی ژێـر چـوارپەلیان لـە پروشـکی میزەکـە پەپکەی دەکرد و تەڕ دەبوو، دووبارە ئەوان کەوتنەوە ڕێ، ڕێگاکە هەر بەرەو پێشەوە دەکشا و چیاکانیش لەدواوە بەجێ دەمان و پتروپتر دوورتر دەکەوتنەوە. بەخێرایی باغەکانی دەوروبەری شار بەدەرکەوتن و ڕێگاش بە هاتوباتر بوو، لێرەوە باوکە سەرلەنوێ ڕێشمەکەی گرتەوە دەست و کارێکی باشیشی کرد. لەم کاتەدا سوڵتان مرادیش وەختی نەبوو حەواسـی لـەلای ڕێشـمەو ئەسپەکان بێ شار دەست پێدەکرد و سوڵتان مراد نوقمی ناو غەڵبە غەڵب، ڕەنگ و بۆنان بوو وەك ئەوەبوو، کە تەوژمێکی خێرا ئـەوی داوەتـە بـەرخۆی و شـەپۆلەکانی ئـەویان بەتەقڵـەو ڕاپێچەکدان پێش خۆیان داوە.

هەمان کات، هەر لەو ڕۆژە پڕ لەخۆشیەدا بەختێکی وای هـەبوو، کـە کـەس نـەیبێ: لـە ئاتچابار، لەناو بازاڕی گـەورەی مـاڵات فروشـتندا لـە جـەمبول بەرێکـەوت ئـاژەڵی بـاغی ئاژەڵانیان هێنابوو. ئای کە ڕێکەوتێکی سەیرە! مرۆڤ یەکـەم جـاری بـێ بێتـە شـارو لەوێـدا چەندان ئاژەڵی جۆراوجۆر ببینێ. سەرەڕای ئەمەش چەرخ و فەلەك و ئاوێنەی، کە قـەدو بـاڵا بچووك دەکاتەوەو دەشکێنێتەوە لەوێ بێ.

٢- سوڵتان مراد سێ جاران چووە ژووری پێکەنین و ژووری ئەو ئاوێنانەی، کە قـەدو بـاڵا کورت دەکەنەوەو خواروخێچ دەکەن، هەرجارێکی دەچـوە ژووری تێـر پێدەکـەنی و دەهاتـەوە دەرێ و هێمن دەبۆوەو دووبارە دەچۆوە بەر ئاوێنە سەیروسەمەرەکانەوە.

مرۆڤ بەژن و سەروسەکوتی عەجیب و غەریب دەبوو، چ شتانێك!

کە جنۆکەش فکری بۆی ناچێ ئەم کەل و پەلانە دروست بکا.

باوکە، عارەبانەکەی لەپێش قاوەخانەیەکدا ڕاگرت، کە قاوەچـیەکەی دەناسـی بـۆ ئـەوەی چاوێکی لەعارەبانەکەوە بێ، ڕۆیشت و سوڵتان مرادی بۆ بازار برد یەکەم جار سەری لە دۆست و ناسیاوانی ئەو ناوە داو کەوتە سلاو و ئەحواڵ پرسینیان هـەروەها کوڕەکەیشـی پێناسـاندن: (ئەمە کوڕە گەورەمە! ).

برادەرەکانی باوکی لەجێی خۆیان کەمێك بڵند دەبـوون، دەسـت بەسـنگەوە سـڵاویان لـە سوڵتان مراد دەکرد باوکە بە رازیبونێکەوە دەیگوت: (مرۆڤـی بەئـەدەبن، تەماشـای تەمـەن ناکەن ئایا گەورەی یان بچوکتری ئەوان هەمیشە حورمەتی بەرانبەرەکەیان دەگرن... )

پاشان بەبەردەمی ڕیزە فرۆشیارو دووکانانـدا ڕەت بـوون و سـەریان لـە موغـازان داو لـە هەمووش گرنگتر ئەمەیە، کە سەریان لە باخچەی ئاژەڵانی سەیار دا. ئـەوان بـەنێو ئـاپۆرەی خەڵکی بە پاڵەپەستێوان دەرۆیشـتن و لەهـەموو قەفـەز و دووکانـەکانی دیکـەی گیانـەوەران سەریان خواردەکردەوە، فیل، ورچ، مەیمون، عەنتەر[١٥] و زۆر گیانداری دیکەیشی لێبـوو... . بە تایبەتی ئەو فیلەی لەوێ بوو ڕێك لەمێشکیدا چەسپیبوو. فیلێکی لەنـدەهۆر و زەبـەلاح، ڕەنگ خۆڵەمێشی وەك گردێك بوو، کە پووشەکەی سووتابێ. فیلێك بوو بەردەوام لەسـەر ئـەم پێ بۆسەر ئەوپێ دەوەستا و خەرتومەکەی بەملاو ئەولادا دەبرد و جۆلانەی پێدەکرد. بەراستی ئەمەیان دیمەنێکی حیسابی و خـۆش بـوو. خـەڵك لەبـەردەمی ڕاوەسـتابوون و شـتی سـەیرو ئەفساناویان لەبارەوە باس دەکرد، کە گوایا فیل لە مشك دەترسێ، نابێ گاڵتەی پـێ بکـرێ، ئەگینا خۆی ڕادەپچکڕێنێ و زنجیر دەپپسێنێ و هەموو شارەکە پان و فلـیچ دەکاتـەوە، بـەڵام سوڵتان مراد بەر لەهەموان زۆر دڵی بەوەسفی پیرەمێردێکی ئۆزبەکی خۆش بوو، کـە گـوتی: (فیل زیرەکترین گیانلەبەری دنیایە لەکاتی کارکردندا لەناو جەنگەڵـدا داری زۆر سـەنگین و گران بەرز دەکاتەوە، جگە لەمە ئەگەر مار یان زیندەوەرێکی ترسناك هەڕەشـە لـە منـداڵێك بکاو مرۆڤی بەتەمەن و گەورەی لێوە نزیك نەبن بەخەرتومەکەی منداڵەکە بەرز دەکاتەوە).

باوکیشی ئەم جۆرە وەسپ و پێداگوتنانەی بەدڵ بوو و لە حاڵێکدا وەستابوو لەسەرسامیان سەری بادەداو چوکەچوکی بوو هەر جارەی بەکوڕەکەی دەگوت (گوێـت لێبـوو؟ شـتی چـەندە سەیر لە دنیادا هەیە! ) هەڵبەتە ژووری پێکەنینەکەیشـی هـەر لـەیاد مـابوو، لـەوێ مـرۆڤ چەندەی بیەوێ ئەوەندە پێدەکەنێ تا دەبوورێتەوە... .

سوڵتان مراد بەگۆشەی چاو تەماشایەکی میرزا گوڵی کرد، کە چەند تەختەیەك لەو لاتردا دانیشتبوو و بەشەیتانێکەوە بـیری کـردەوە: (شـازادەی جـوانی! ئەگـەر تـۆ دەچـویتە ژووری پێکەنینەوە یەکسەر لەرەی دەنگت دەگۆڕا هەر، کە خۆت بەسەروسەکوتێکی عەجایبەوە لـەو

(١٥) عەنتەر: جۆرە مەیمونێکی کلك دارە.

ئاوێنانەدا دەدیت چیدیکە فیزو هەواو لووت بەرزیت نەدەما). بەڵام سوڵتان مراد یەکسەر لە بیرکردنەوەکەی شەرمی لەخۆی کردەوە.

کە بۆچی لەوکچەی هەڵپێچاوە؟ مەگەر ئەو خراپەکی دەرحەق کردوە؟ کچێکە وەك هەموو کچەکان ئەو نەشمیل و جوانە، لەهەموو کچەکانی پۆلەکە جوانترە، دەباشە کەچی بووە! مەگەر بەجوانییەکەی گوناهکارە هەندێ جارانیش نومرەی خراپ وەردەگرێ.

جارێکیان خانمی مامۆستا لەناو دەرزدا ئاوێنەی لێگرتوو پێی گوت:

ـ جارێ زووە بۆت کە لەئاوێنەدا سەیری خۆت بکەی.

ـ میرزا گوڵ لەشەرمان سوور سوورهەڵگەڕاو هێندەی نەمابوو لە پڕمەی گریان بدا.

لەو وەختەدا سوڵتان مراد زۆر دڵی پێی سوتاو لەدڵی خۆیدا گوتی: (ئێستا چی رووی داوە، رەنگە ئاوێنەکە بەرێکەوت بێتە ناودەستی).

سوڵتان مراد جارێکی دیکە تەماشایەکی ئەولای کرد و دڵی پێی سووتا چونکە دیتی میرزا گوڵ لەشەرمان چۆتەوە قاوغی خۆی و رەنگی شین و مۆر هەڵگەڕاوەو چاوە تەڕەکانی وەك بەردی تەڕ دەبریقانەوە، ئاخر رەنگە بگرێی، هەم باوکی و هەم برای لەبەرەکانی جەنگن... . بۆ ئەوە ناڵێ، ئای کە خراپ بیر لە کچۆلەیێکی وا دەکاتەوە، ئای عەجەب ئەحمەقێکە، بەراستی ئەحمەقە.

زۆر لە قوتابییەکان لە ناو پۆلدا کۆخەکۆخیانە، چۆنە ئەویش کۆخەیەك بکات؟ ! بەئانقەس خۆی هێنایە سەرشێوەو حاڵی کۆخەکردن، مەگەر چی بووە؟ هەموو هەر دەکۆخن ئەو لە کەس کەمترە؟ خانمی مامۆستا ئینکەمال ئاپای بەچپەنیگاییکی پڕماناوە سەیرێکی ئەوی کرد و درێژەی بەدەرسەکەی خۆیدا.

٣- ئەوان دوای تەماشاکردنی گیانلەبەران و ژووری پێکەنینەکە چونە بازاڕی کۆنە فرۆشان و لەوێ کەوتنەکڕینی چەند دیاریەك بۆ حاجی مراد هەفت تیریکی نوێ و جوان و بەباق و بریقیان کڕی و کەهەر لە دەمانچەی بەراستی دەچوو بۆ کچۆڵەکانیش تۆپی رەنگاوڕەنگی و نەرمۆڵەیان کڕی[١٦] بۆ دایکی سەرپۆشێك و ئینجا زۆر جۆرە شیرینیان کڕێ...

بەسەرانسەری بازاڕەکەدا خولانەوەو هەموو شتێکیان دیت ئەو تەنیا سواری چەرخ و فەلەك نەبوو، باوکەکەی داوای ئەمەی لێنەکرد و گوتی ئەمە بۆ منداڵانە تۆ ئیتر گەورەی و پاشدان

---

(١٦) نووسەر باسی تۆپێك دەکا، کە بەلاستیکێکەوە بەستراوە کەدەیهاوێ دووبارە بۆت دەگەڕێتەوەو... هتد.

بە گاڵتەوە گوتی هەریەك دوو ساڵی دیکەیە ژنت بـۆ دەهێـنم لـە نزیـك چـەرخ و فەلەکـەوە وەستان و تەماشایان کرد دوایی باوکی پەلەی کردو گوتی: دەبـێ خۆمـان بگەیەنینـە کۆگـای نەوت و بۆشکەکان پڕ لەنەوت بکەین و بکەوینـەوە ڕێگـا. کاتەکـەمان تەنگـە لەراستیشـدا کاتێك، کە گەیشتینە کۆگای نەوت خۆر لەوبەری شار بەرەو خوار لار دەبـۆوە. لـەوێوە چـونە دەرەوەی شـار و لـە قاوەخانـەی سـەر ڕێگـادا پلاویـان خـواردو بـەرەو مـاڵ ملـی ڕێگایـان گرتەوەبەرێ.

خۆرنشینان باغەکانی دەرەوەی شاریان لەدواوە بەجێ هێشـتبوو، سـەر لـەنوێ ملـی ئـەو ڕێگایەیان گرتەوە بەر، کە بەیانی لێیەوە هاتبوونە شار. سەر لـەئێوارە گـەرم و پـڕ لـەبۆن و بەرامەی جیاجیای هاوینی بوو بۆق لە جۆگەلەکانی کەنار ڕێگادا قیرەقیریان بوو ئەسپەکان بە هەنگاوی یەکسان و سەنگین ڕێیان دەکرد بە بەرمیلی پڕەوە ناکرێ زۆر بڕەتێنـرین و ڕابکـەن. سوڵتان مراد بەرەبەرە خەریك بوو خەو دەیبردەوە، ماندو بوو، چۆن ماندو نەبێ، ئەمڕۆ ڕۆژێك لەڕۆژە خۆشەکانی ژیانی بوو زۆری خەو دەهـات سـوڵتان مـراد خـۆی خزانـدە پـاڵ بـاوکی و بەسەری ڕحەت خەو بردیەوە.

ناوناوێك، کە عارەبانەکە لـە چـاڵ و قوڵتاییـانی دەدا بەخەبـەر دەهـات، دووبـارە خـەو بەسەریدا زاڵ دەبۆوە و هەرجارێك بەر لە خەولێکەوتنی بەبیری دەهاتـەوە: چـەند باشـەکە لـە دنیادا باوك هەیە لە شانەکانی باوکی هەستی بە ئارامی و دڵنیایی دەکرد و عارەبانەشـی بـە تەق و هۆڕ دەرۆیشت و سمی ئەسپەکانیش بەزەویدا دەکوتران.

دوای قەدەرێك، کە سوڵتان مراد هێشتا هەر نوستبوو نەیدەزانی چەند وەختە بە ڕێگاوەن، عارەبانەکە وەستا. دەنگە دەنگ و تەق و هوڕی چەرخەکان ئارام بـۆوە. هـەموو شـتێك کـپ بۆوە. باوکی ئەوی بە باوەشی خۆی هـەڵگرت و بردیـە جێگایـەك لـە حاڵێکـدا بـە سـینگی خۆیەوەی دەچەسپاند، لەژێر لێوەوە گوتی:

ـ چەند گەورە بووە، هەر هەڵناگیرێ! چەندە گران بووە!

پاشدان لەسەر گیشە پووشێکی داناو بەچاکەتەکەی داپۆشی و گوتی:

ـ تۆ بنوو، من ئەسپەکان دەکەمەوە کەمێك بلەوەڕێن.

سوڵتان مراد چاوەکانیشی نەکردەوە و لەو خەو و بێداریەیدا چێژی وەردەگرت.

تەنانەت دیسان بیری کردەوە: (چەند شتێکی باشە، کە لەدنیادا باوك هەیە).

لەپاشدان جارێکی دیکـەش کاتـێ، کـە بـاوکی قـەیتانی پۆتینـەکانی پێـی کـردەوە بـە ئاگاهاتەوە دیار بوو پۆتینـەکان بـە درێـژایی رۆژ پێیـەکانی دەگـرت، چـۆن بـاوکی هەسـتی بەوەکرد، کە پۆتینەکان پێیەکانی ئەویان دەگوشی؟

سولتان مراد لە حالێکدا لە لەش و گیانیدا هەستی بە ئازادیەکی تەواو دەکرد وەك ئەوەی مەلە بکا و خۆی دابێتە دەست تەوژمێکی بێ گرێ و گۆل و وەستان، وای هاتە بەر چاوان، کە شەپۆلێکی شنە با پووش و پەلاشی جۆراوجۆری خستۆتە کەروێشکەوە، ئەویش بەسەر پـووش و پەلاشدا رای دەکرد، مەلەی تێدا دەکردن و ئەستێرەکان لە ئاسمانی بێدەنگدا دەکەوتنە سـەر ئەو پووش و پەلاشە جارێك لە لێرەو جارێکی دیکە لە وێ بـە کپـی سـەرەو خـوار ئەسـتێرە دەرژان، بەلام تائەو بەراکردن خۆی بەوێ دەگەیاند ئەستێرە خـامۆش دەبوونـەوە ئـەو زانـی خەودەبێنێ کاتێ، کە بەئاگا دەهات گوێی لێدەبوو کەوا چۆن ئەسپە پێوەندکراوەکان قەپاڵ لـە گیاوگۆڵی وردیلەی تازە دەگرن و خرم و هۆریان چۆن لەدەوری خەرمانی کا دابن دێ و لەحالێك دەنگی زەنگی هەوسارە رەهاکانیان دەهاتە گوێ و هەنگاویان هەلدێنا ئەو دەیزانی، کە باوکی لەرۆخ ئەودا نووستووە و ئەوان لەم دەشتە چۆلەدا سەر خەوێك دەشکێنن و هەر ئەوەندە بەسە چاوەکانی بکاتەوەو لەئاسمان ئەستێرەی رژاو و کشاو ببێنـێ، بـەلام نەیدەویسـت دوای ئـەو خەوە خۆشە چاوەکانی بکاتەوە دوای نیوەشەو هەوا فێنکی کرد، هەر خـۆی بـەرەو لای بـابی خزاند تاخۆی نایە پاڵ باوکی ئەوساکە باوکی بەخـەوالۆیی ئـەوی لـەباوەش خـۆی نـاو باشـتر بەخۆیەوەی نووساند، ئەوان لە رێگادا لە کێلگەیەکی پاك لە ژێـر ئاسمانـدا نووسـتبوون ئێـرە لەکوێ و سەنیری[(١٧)] نەرم و مالەوە لە کوێ!

لەپاشان زۆر جاران ئەو ئەستێرانەی دەهاتنەوە یاد.

قەتێیەك لەو نزیکانەوە، کە هـەردوو هـەنگاویان لێ دور دەبـوو بـەدەنگێکی خـۆش وەك زەنگولە تابەری بەیانی خوێندی... . دەبێ هەموو قەتێیێکی دنیا خۆشبەخت بن.

٤- ئینکەمال ئاپای هاتە تەنیشت کورسیەکەی ئەو وگوتی:

ـ سولتان مراد چیتە؟

تەنیا لەم کاتەدا بوو مراد ئاگای لە مامۆستاکەی بوو. سولتان مراد لەجێی خۆیـدا بلنـد بوو و وەك بلێی پاکانە بۆخۆی دەهێنێتەوەو گوتی:

---

(١٧) سەنیر: سەربن، بالیف، پشتی سەرین.

ـ هیچ، هیچم نییه.
پۆلەکە هەمان شێوە ساردو کپ بوو پێکەنین و کۆخەی ئاسایی منداڵان دەبیسترا.
ئینکەمان ئاپای لە حاڵێکدا لەسەرمان شانەکانی دەجولانەوە بە نارازیبوونێکەوە گوتی:
ـ کاتێك لەخۆڕاو بەبێ هۆ دەکۆخی و گوێت لە پرسیار نابێ واباشترە بچی پووش و پەڵاش بێنی و زۆپاکەمان بۆ گەرم کەی.
سوڵتان مراد بەئامادەییەوە لە جێگای خۆی راپەڕی و تا فرمانی مامۆستا جێبەجێ بکا. هەڵبەتە لە ناوەراستی دەرسدا رێکەوتی وا نایەتە پێشەوە. چاودێرەکانی پۆل تەنیا لەکاتی زەنگی پشوودا کاو کۆت دەهێننە پۆل و زۆپاکە گەرم دەکەن، لەکاتی دەرسدا کەم شتی وا روو دەدات، ئەو بە پەلە هاتە بەردەرگای قوتابخانە بەفرو بارانی بەسەردا باری ئاه، ئێرە، کە سەیلان نییە! هەر، کە لە حەوشەوە بەرەو کادین ڕایدەکرد، دیتی تێن عەلیۆف سەرۆکی کۆلخۆز، کە لەبەرەکانی شەڕدا بریندار ببوو لە ئەسپەکەی دابەزی ئەو لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر لاو بوو، بەڵام لاو و نیو دەڕۆیشت چەند دەندەی پەراسوێکی کەم بوون روون و ئاشکرا بوو کە لە پەڕەشووت خۆی هەڵداوە ئەو چەنز باز بوو دەڵێن بەر لە جەنگ ئەندازیاری کشتوکاڵی بووە، بەڵام سوڵتان مراد ئەمەی لەیاد نەماوە هەموو شتەکانی پێش جەنگ، وەك دنیایەکی دیکە وایە و باوەڕ ناکرێ، کە ئەوساکە بەر لەجەنگ دنیا وابووبێ.
سوڵتان مراد باوەشێکی گەورەی پووش و پەڵاشی وشك هەڵگرت و گەڕاوە و بەپێیەکانی دەرگای کردەوە هاتە ژوورەوە، منداڵەکان پسکەپسکیان کرد و کەوتنە جووڵەجووڵ.
ئینکەمال ئاپای گوتی:
ـ بێدەنگ، فکر و حەواستان پەرت مەکەن، سوڵتان مراد! تۆش بەبێ دەنگە دەنگ و چرپە چرپ کاری خۆت بکە.
لەناو زۆپاکەدا، ئاگرێك دەبریسکاوە، کە لەناوەڕاستیدا لەکزی و کەم و گڕوگەرمی هەر لە هەناسەی منداڵ دەچوو. سوڵتان مراد چەپکێك پووشی لەسەر داناو فووی لێکرد. ئینجا دەستەیەکی دیکەو دەستەیەکی دیکەیشی لەناو زۆپاکە ئاخنی زۆپاکە لە حاڵێکدا پووش و پەڵاشە ووشکەکەی هەڵدەلووشی کەوتە نێڵە نێڵ و گڵپە، ئەو پێڕانە دەگەیشت وشەکانی بهاوێتێ، پۆلەکە گیانێکی هاتەوە بەر، حەزی دەکرد، سەری بەلای منداڵەکان وەرسووڕێنێ و خۆی بەهەندێ شێوەو شەکلی سەیر دەربهێنێ لاسایی هەندێ بکاتەوەو پێبکەنێ و هەندێکیان بەتایبەتی ئاناتای کەلەسەر کورسی تەختە لە دواوە دانیشتبوون بەپارێزەوە بە مست

هەرەشەی لێبکا سولتان مراد بیری کردەوە مستی بە عەلامەتی پەنجەی گەورەی[18] نیشانی ئاناتای بداو پێی بڵێ وەرە بەرێ! ئەو لەهەموان بەتەمەنتر بوو پانزە سال و نیو بوو، شەڕانی بوو، هەندێ جار دەوروخولی میرزا گوڵی دەدا، بەڵام نەدەکرا خانمی مامۆستا جیدی و بوو، پێویستی بەوە نەدەکرد مگێڕی مامۆستا تاڵ بکا ئاشکرا نەبوو کە بۆچی لەم دواییی دواییانەدا نامەی کوڕە تاقانەکەی پێناگا ئەو فەرماندەی یەکەی تۆپخانە بوو، خانمی مامۆستا زۆر شانازی پێوە دەکا دیار نییە، کە پیاوەکەی لەکوێ ون بووە، لە زەمانی بەر لە جەنگ دا بەڵاییکی بەسەر هاتووە تا خەڵکیش نالێن کەچی بەسەر هاتووە لەبەر ئەمە بووە ئینکەمان ئاپای هاتۆتە (ئائیل) و لێرە بۆتە مامۆستا کوڕەکەی لە فێرگەی پێدا گۆگی[19] شاری جەمبول دەیخوێند و هەر لەوشەوە چووە بەرەی جەنگ. ئینکەمال ئاپای هەر کە لە پەنجەرەوە چاوی بە پۆستەچی سوارە دەکەوێ، لەم کاتی دەرس خوێندنەوەدا یەکێك دەنێرێ تا سەروسۆراغی نامەی لێوەرگرێ، کەسێکی کە دەچێتە کن پۆستەچی، ئەگەر نامەی بۆ مامۆستا پێبێ وەك گوللە بە ڕاکردن دەگەڕێتەوە.

تا نۆبەتیش گیراوە، کە جاری دواتر کێ بۆ سووراغی نامە دەچێتە کن پۆستە چیەکە.

ئەو وەختەی نامە دەگا جەژنێکی تەواوە ئینکەمال ئاپای هەمان کات بەکورتی نامەکەی دەخوێندەوەو کاتێك سەری لە سەرنامەکە هەڵدەگرێ، وەك ئەوەیە مامۆستایەکی دیکە هاتبێتە پۆلەکەوە بەدیتنی ئەوەی خانمی مامۆستا، بەو بسکە سپیانەوەی کەبە تەرزێکی ڕێك و بەسەلیقەوە لەژێر سەرپۆشەکەی قەراریان گرتبوو دڵی چەندە خۆش دەبێ ئارام و بێباك دەبێ، دە ئەوجا وەرە بە دیتنی فرمێسکی چاوەکانی ئەو دڵی مرۆڤ تەنگ نەبێ و نەگوشرێ.

ئەو هەوڵدەدا، کە بەری لەرزینی دەنگی بگرێ و دەڵێ:

ـ براکەی ئێوە، زیندوو و سپ و ساغە و دەجەنگێ و سڵاو لە هەمووتان دەکا.

ـ پۆلەکە دڵخۆشیی خۆیان ناشارنەوە هەموویان پێدەکەنن، وەك ئەوەی لەگەڵ ئەودا ببنە یەك و لەخۆشی ئەودا بەشداری دەکەن، بەڵام ئەو دەقەیەك دواتر بەبیری دێتەوە و دەڵێ:

---

(١٨) ئەم شێوەیە: دەبێ چوارپەنجەت بۆ ناو لەپت ببەیتەوەو پەنجەی گەورەی دەستت قیت ڕاگری، مانای خواستی سەرکەوتن و چاکە دەگەیەنێ.

(١٩) پێداگۆگ: پەروەردەکەری منداڵان.

ـ منالاَّن ئێستا دەست بەدەرسەکەمان دەکەینەوە لەو وەختانەدا، کە باشترین بـە پێزتـرین دەرس گوتنەوە دەستی پێدەکرد، وشەکانی ئەو زۆر پڕ کاریگەری بـوون هــەر بیرکردنەوەیــەکی بیرێکی دیکەی رادەکێشا و هەموو ئـەو چشـتانەی ئـەو باسـیان دەکـاو روونیـان دەکاتـەوەو دەیسەلمێنێ دەچێتە ناو گیان و زەینی قوتابیانەوە و کاریان لێدەکا و دەچێتە دڵیانەوە، ئەمـە ئەو وەختەو ساتەی بوو، کە پۆلەکە شەیدای دەبوون.

لەم دواییەدا شتێك خانمی مامۆستا نیگەران دەکا... . و رەنگە هەر ئەمەیە، کـە کاتـێ تین عەلیۆف سـەرۆکی کۆڵخـۆز بەهاورێیـەتی بەڕێوەبـەری قوتابخانـە لـەناو دەرگـای پۆلەکـە پەیدابوو، ئینسکەمان ئاپای لەسەرەخۆ لەسەرەخۆ بەرەو تەختە رەشەکە کشاوەو هێزی دابـەر خۆی تابڵێ:

ـ منداڵان هەڵسن سوڵتان مراد تۆش لە شوێنی خۆت دانیشەوە.

سوڵتان مراد دەرگەی زۆپاکە دەبەستێ و بـەخێرایی دەچـێتەوە سـەر کورسـیەکەی خـۆی سەرۆکی کۆڵخۆز و بەڕێوەبەری قوتابخانە دێنە ناو پۆلەکەوە و سڵاو دەکـەن و پۆلەکـەش وەڵام دەدەنەوە:

ـ سڵاو.

بێدەنگیەك باڵی بەسەر پۆلەکـەدا کێشـا، تـا کەسـیش نـەکۆخی ئینکـەمان ئاپـای بـە دەنگێکی سەبر پرسیاری کرد.

ـ شتێك رویداوە؟

تین عەلیۆف بۆ هێمن کردنەوەی گوتی:

ـ ئینکەمال ئاپای هیچ شتێك رووی نەداوە. من بۆ کارێکی دیکە هاتوومەتـە ئێـرە مـن چەند قسەیەکم لەگەڵ منـداڵان هەیـە و داوای بـوردن دەکـەم کـە لـەکاتی وانـە گوتنـەوەدا هاتوومەتە ژوورەوەو سەری بۆ لای بەڕێوەبەری قوتابخانە وەرسووراند و درێژەی بەقسەکانی دا:

ـ مۆڵەتیان دامێ، کە لەکاتی وانە گوتنەوەدا بێمە ژوورێ.

بەرێوەبەر بۆ جەختکردنەوە لەسەر قسەکانی ئەو گوتی: ـ

ـ بەڵێ، قسەو باسێکی گرنگ هەیە، منداڵان دانیشن.

منداڵەکان هەموویان دانیشتنەوە.

هەموویان سەرۆکی کۆڵخۆزیان دەناسی هەرچەندە ئەو هێندە نەبوو سەرۆکایەتی کۆڵخۆزی گرتبووە دەست، یەعنی لە پایزدا، دوای گەڕانەوە لەبەرەی جەنگ جگە لەمـە ئـەو لێـرەدا و

بگره هەمووی دەناسین. ئەو بۆ ئاشنایەتی نەهاتبوو ئـەم ئاشـنایەتیە چ پێویسـتی نـەدەکرد. قوتابیانی پۆلی حەوتەم لە ئائیل بەرچاو بوون دەکرا لەگەڵ هەریەکێکیاندا لەهەر جێگایـەکی ئائیل: لە ماڵەوە، بەڕێوەبەرایەتی کۆڵخۆز، لەرێگاو هەرشـوێنێکی دیکـەدا دەکـرا قسـەیان لەگەڵ بکرێ، بەڵام  هەرکە سەرۆکی کۆڵخۆز بیـەوێ قسـەو باسـێکی تایبـەتی، کـە لەگـەڵ قوتابیەکان بکا و بێتە قوتابخانەو لەکاتی دەرسدا بێتە ناو ژووری پۆلەوە، شـتێك بـوو پێشـتر رووی نەدابوو، دەبوو ئەمە چ قسەو باسێك بێ؟ هاوین قسەو باسێکی دیکەیە،

تین عەلیۆف لەحاڵێکدا بە وردی بەقیافەییێکی جیددی و چـاودێرانە سـەیری منداڵـەکانی دەکرد و هەوڵی دەدا، کە قیت و قنج بوەستێ تا خواری و لاریـی لاتەنیشـتی هێنـدە نەیەتـە بەرچاوان و دەستی بەقسان کرد:

ـ ئەو کارەی، کە بەئێوەمە ئەمەیە: قوتابخانەکەتان سارده من جگە لەوەی پـووش و کـاو کۆتتـان بـدەمێ هیچـی دیکـەم لەدەسـت نایـە. دیـارە، کـە پووشـیش گـڕ دەگـرێ و زوو دادەمرکێتەوە، تەپاڵەییێکی کە جاران قوتابخانەیان پێ گەرم دەکرد، لە چیاکاندا لەناو گوش و گۆنیان کۆیان دەکردنەوەو بە عارەبانان دەیانهێنا، ساڵی پێشوو نەکەس هەبوو ئەم کارە بکـاو نە دەرفەتی ئەم کارەش هەبوو، هەموو بۆ بەرەکانی جەنگ چوون. مـن دوو تـۆن خـەڵوزم لـە ئەنبارێدا شاردەوە لە جەمبول لە مۆنۆپۆل[٢٠] چیانم کڕی.

ئەم خەڵوزە بۆ کارگەی ئاسنگەریە من ئاسنم بۆ کارگەی ئاسن کـڕی و ئەویشـم هـەر لـە مۆنۆپۆل چیان کڕی، ئێمە لەکاتی خۆیدا گەڵ ئەوان مەبەستم مۆنۆپۆلچیەکانە حسـابمان پـاك دەکەینەوە ئێستا بارەکەمان زۆر خراپە و دەرفەتی ئەم کارەمان نییە باروزروفی بەرەی شەڕیش زۆر دژوارە، پارەکە لە توانامانـدا نەبوو پیڕانەگەیشتین، کە قەدەری دووسەد هێکتارێـك زەوی تۆ بکەین کەس لەمە کەمتەرخەم نییە، جەنگە کەس قسەی لەسەر ئەوە نییە، بەڵام  ئەگـەر هەموو شوێنێك و کۆڵخۆزێك و سۆخۆزێك وەك کۆڵخۆزەکەی ئێمە کەم کار بکەن و حاسڵاتیان کەم بێ و کارەکانیان بە تەواوی ئەنجام نـەدەن. ئـەو کاتـە رەنگـە نـەتوانین بەسـەر دوژمنـدا سەرکەوین. بۆ ئەوەی بەسەر هێزێکی ئەوهادا سـەرکەوین دەبـێ نانیشـمان هـەبێ و چـەك و تفاقیشمان هەبێ، منداڵان ئەمەیە کە منی بۆ لای ئێوە هێناوە پێویستە هەنـدێکتان واز لـە قوتابخانە بێنن. کات زۆر کەمە. دەبێ وڵاغەکان بـۆ شـۆبڕینی بـەهارە ئامـادە بکـرێن. ئـەم

---

(٢٠) مۆنۆپولچی: احتکارچی.

ولآغانه له بارێکی زۆر نالەبارو خراپ دان. بە زۆر لەسەر چوار پەلیان وەستاون. دەبێ ئەسپابی ئەسپەکان ئامادە بکرێن. هەموویان کۆن و بێ کەڵك بوون، نیرو گاسنەکانیش مەکینەکانی تۆکردنیش پێویستیان بە چاکردنەوە هەیە هەموویان لە ژێر بەفردان... . بۆچی من هەموو ئەو قسانە دەکەم؟ لەبەر ئەوەی فرمانمان بەدەستە لەو زەویانەی، کە بەروبوومی پایزەیان لێ نەکراوە بەرووبوومی بەهارەیان لێ بچینین. ئێمە بە هەر جۆرێکی، کە بووە بێ چەند و چۆن وەك بەرەی جەنگ دەبێ ئەو کارە جێبەجێ بکەین، ئەمەش مانای ئەمەیە، کە بە هێزو بازووی خۆمان و بەپێی نەخشەو پلان لە دووسە هێکتاردا بەرهەمی بەهارە بچێنین دووسەد هێکتار! ئاگادارن دەزانن چەندە؟ کێ دەبێ ئەم کارە بکات، دەبێ پشت بەکێ ببەسترێ؟ ئەمەیە، کە ئێمە بڕیارمان داوە سەرەڕای هەموو شتێکی، کە لەبەردەستماندایەو هەموو ئەو کارانەی، کە هەر ئێستا بۆ کشتوکاڵی بەهارە ئامادە دەکرێ، دەستەیەکی کێلانی دیکە ئامادە بکەین بیرمان کردەوە سەیرمان کرد ناکرێ ژنان بنێرین، چونکە دوورە، لە (ئەکسای)ـە، کەسیش نییە، ئەمەبوو بڕیارماندا لە قوتابیانی قوتابخانە کۆمەك وەرگرین.

تین عەلیێف سەرۆکی کۆڵخۆز، ئەم مرۆڤە سەخت گیرو خۆگرە، کە هەمیشە بەروانکەی بێ قۆڵی خۆڵەمێشی سەربازیی لەبەر دەکردو هەڵبەتە سەرمای دەبوو، کڵاوی گوێچکەداری خۆڵەمێشیی لەسەر دەکرد و قیافەیەکی خەمخۆرانەو بڕیاردەرانەی هەبوو و لەگەڵ ئەمەشدا کەهێشتا گەنج بوو، چەند دەندەیەکی پەراسووی لەدەستدا بوو لاکەلەکەی خوارببۆوە جانتای کارو خزمەتگوزارییە سەربازییەکەی خۆی هەمیشە بە قەدەوە دەکردو ئەم قسانەی کرد...

تین علیێف سەرۆکی کۆڵخۆز، کە لە پێش تەختە رەشی پۆل لە تەنیشت نەخشەی جوگرافی راوەستابوو ئەوهای گوت: نەخشەیەکی، کە لە ناویدا هەموو گۆیی زەمین و دەریایەکان و لەگەڵ تێکڕای ولآتانی وەك سەیلان، جاوا، سۆماتراو ئوسترالیای تێدا جێکرابۆوە، کە گەرم و وەك بەهەشت بوون و لەوێدا دەکرێ بەبێ کار بژی و لە بێکاریان مێش و مەگەز لەخۆت دەکەی، تین عەلیێف سەرۆکی کۆڵخۆس لە قوتابخانە بەمجۆرە قسەی کرد... لە قوتابخانەیەك کەلەناو سۆپاکانیدا پووشیان دەسووتاند، یەعنی ئاگرو دوێك، کە خۆڵەمێشی لە گەرمایی زیاتر بوو کاتێك، کە ئەو گوتی لە ئەکسای دوورە دەست دووسەد هێکتار سەرەڕای دانەوێلە بۆ بەرەکانی جەنگ بکرین، وەك ئەوەی لە حەوشەدا وەستابێت ئەوها هەڵم لە دەمی هاتەدەر... .

تین عەلیێف سەرۆکی کۆڵخۆز ئەو قسانەی کرد.

لەو دیوی پەنجەرە لە دەرەوە، بـا هـەڵی کردبـوو، لـە درزەکـانی پەنجـەرەوە دەهاتـە نـاو هۆڵەکەوە. سوڵتان موراد دەیدیت، کە ئەسپی سەرۆکی کۆڵخۆز لەبەر بەفر چۆن سـەری خـۆی لەبەر باو بۆران تەکاندەدا و سمی لەعەرزدا دەکوتیێ. باکەش یاڵی ئـەوی پـەخش و پەرێشـان دەکرد و کلکە شۆڕەکەی بەلادا دەخست. ئەسپەکە سەرمای بوو... ئـاخر خـۆ ئێـرە سـەیلان نییە.

تین عەلیۆف روونی کردەوە گوتی:

- من هەروا ئێوە لە ناو دەرسەکە جێ ناهێڵێم. ئەمە کارێکی ناچاری و بەزۆرییە، ئەمـە بزانن. دوای جەنگ و رەنگە زووتریش، ئەگەر بمێنم، خۆم ئەم منداڵانـە بـۆ قوتابخانـەو دەرس خوێندن دەهێنمەوەو داوا دەکەم، کە خوێندنەکەیان درێژە پێ بدەن، بەڵام ئێسـتا بارەکـەمان بەمجۆرەیە.

پاشان بەڕێوەبەری قوتابخانە قسەی کرد، لە دوایدا دووبارە تین عـەلیۆف کەوتـەوە قسـە. کاتێك، کە لەناو پۆلەکەدا جۆش و خرۆش دەستی پێکـرد، منداڵـەکان دەسـتیان کـردەوە بـە دەست بەرز کردنەوە، بەم مانایەی، کە من ئامادەم کار بکەم.

تین عەلیۆف یەکسەر کەوتە روونکردنەوە:

- ئەگەر کەسێك وابزانێ کەئێمە پێویستمان بەهەموو قوتابییەکە ئەوا خەیاڵی خاوە. هـەر کەسێك دەرسەکانی خراپ بخوێنێ خراپیش کار دەکـاو دوومـیش قوتـابی بـاش، لـە دواییـدا ئاسانتر دەتوانێ ئەو وەختەی لە کیسی چووە تێ هەڵێنێتەوە.

تۆ، سوڵتان موراد، وەك قوتابییەکی، کە لەپۆلەکەدا، کە لەهەموویان گەورەتری...

- منداڵەکان کردیانە دەنگە دەنگ

- ئاناتای لە هەموومان گەورەترە، بەم زوانە دەبێتە شانزە ساڵ.

- من مەبەستم ساڵ و تەمەن نییـە، بـەژن و باڵایـە ئەمـەش باسـێکی سـەرەکی نییـە، سەرۆکی کۆڵخۆز سەر لەنوێ رووی دەمی لە سوڵتان موراد کردەوە گوتی:

- تۆ پارەکە شوێنی تەڕەو سەوزەت کێڵا، وانییە؟

سوڵتان موراد بەدەم هەڵسانەوە گوتی: بەڵێ لە خەیابانی ئارال بوو.

- بەی گاسنی دووەم و چوار ئەسپ؟

- بەڵێ بە گاسنی دوودەم و چوار ئەسپ، بەڵام من تەنیا یارمەتیمدا گاسن هی سارت بای بوو، ئەویان بۆ سەربازی بانگ کرد کاری تەڕەوسەزە چاندن وە درەنگ کەوتبوو، لەبەرئەوە بەرێز چەکیش داوای لێکردم هاریکاری بکەم.

سەرۆکی کۆڵخۆز گوتی:

- من ئەوە دەزانم هەر لەبەرئەمە لە تۆوە دەستم پێکرد. هەموویان روویان لە سوڵتان موراد کرد و لەگەڵ میرزا گوڵدا نیگایان کەوتە سەر یەکدی.

میرزا گوڵ بە جۆرێکی وەك بڵێی تایبەتی تەماشای ئەوی دەکرد نەك وەك ئەوانی دیکەو لە پڕ سوورهەڵگەرا، هەر وەك بڵێی باسی ئەو دەکەن، سوڵتان موراد لەم رووداوە نارەحەت نەبوو و دڵی لێی دا.

ئاناتای لە جێگای خۆیەوە هاواری لێهەڵسا:

- منیش زەوی باخچەی سەوزەو تەڕەم کیلاوە!

ئارکین بەگیش وتی:

- منیش.

لە دوای ئەودا دەنگی دیکە دەهاتن. بەڵام تین عەلیۆف گوتی:

- منداڵینە بێدەنگ بن، لێگەڕێن بە نۆرە، باسەکەمان بەڕاستی و جدیە. لە دەرسەوە دەست پێبکەین، دووبارە رووی دەمی لە سوڵتان موراد کردو گوتی:

- تۆ لەگەڵ دەرسەکانتدا چۆنی؟

سوڵتان مراد وەڵامی داوە:

- هێندە نا.

- هێندە نا چی؟

- زۆر خراپ نیم.

ئینکەمال ئاپای، کە بە درێژایی ئەو ماوە بێدەنگ بوو گوتی:

- نەهێندە باشە، من هەمیشە پێی دەڵێم: تۆ دەتوانی پلە بە پلە باشتر دەرس بخوێنی، سەدجار لەمە باشتر، ئەو زۆر تواناو ئامادەگی تێدایە بەدبەختییەکەی ئەوەیە کەمێك دڵی تەڕە، سەرۆکی کۆڵخۆز بەدەم بیرکردنەوە بە ئاوازێکی درێژکراوەوە گوتی:

- بەڵام ... . من چاوەڕێم نەدەکرد... زۆر باشە. باوکت لەبەرەی جەنگە و تۆ نانی بۆ ئامادە دەکەی، ئاناتای ئەدی تۆ چۆن؟

ئاناتای بەدەم ئەوەوە سەری لەبەر خۆی نابوو هەڵدەستا سەرپێ و گوتی:
- هەمان شێوە.
تین عەلیۆف زەردەخەنەیەکی گرت و گوتی:
- دیارە، کە ئێوە وەك یەکن ـ دوای کەمێك درێژەی بەقسەکەی داو کاتێك کە سەر لەنوێ دێنەوە قوتابخانە ئینجا نرخی خوێندن تێدەگەن. من ئەمە دەزانم، هەر لە ئەزموونی خۆمەوە دەزانم هەرکاتێك گرفتێك پەیدابوو هەمیشە دەڵێن، لێی گەڕێ، دەچم کار دەکەم. ئاخر مەگەر مرۆڤ تەنیاو تەنیا بۆ کارکردن دەژیە؟ وانییە ئاناتای؟
ئاناتای ویستی شتێك روون بکاتەوە بەڵام چاوپۆشی لێکرد و گوتی:
- نازانم.
تین عەلیۆف گوتی:
- منیش هەموو شتێك نازانم و ئەگەر جەنگ نەدەبوو، دەچووم دەمخوێند و خەریکی فێربوونی زانست و زانیاری دەبووم.
دەنگی پێکەنینێکی ئاشکراو روون لەناو پۆلەکە هات، پێکەنیناویە، سەرۆکی کۆڵخۆز، کە خۆیشی پیاوێکی بەتەمەنە حەز دەکا بخوێنێ و حاڵی ئەوانەیش ئەو، قوتابیانە، دەرس خوێندن و قوتابخانەیان لەبەر دڵ کەوتووە! .
تین عەلیۆف بەپێکەنینەوە پرسی؟ :
- مەگەر جێ پێکەنینە؟ بەڵێ، منداڵان زۆر حەز دەکەم بخوێنم. دواتر، ئێوە لەمە دەگەن.
لەم وەختەدا کەسێك سودی لەم دەرفەتە وەرگرت و هاتە ناو قسەکانی سەرۆکی کۆڵخۆزەوە:
- (سەرۆکی بەرێز)، راستە ئێوە خۆتان لە فڕۆکە فڕێ داوەتە خوارێ:
- تین عەلیۆف سەری وەك نیشانەی پەسندکردنی قسەکە داگرت.
کوڕیژگە ئارامی لەبەر بڕا بوو:
- عەجایبە! بەترس نییە؟ من جارێکیان لەپشت بانی چوارداغی تووتن خۆمم هەڵدایە سەر گیشەیەك پووش بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەژنۆکانم لەرزین.
تین عەلیۆف کەوتە روون کردنەوە:
- بەڵلا خۆم هەڵدا، بەڵام بە پەڕەشووت. وەك بڵێ گونبەدەو وەك چادر لێك دەبێتەوە.

قوتابیەکان هەمویان بە یەکدەنگ پێکەوە ووتیان:

- دەزانین، دەزانین.
- ئێمە لەیەکەی چەتر بازان بووین و خۆفڕێدان بەچەتر و پەڕەشووت کارمان بوو.

دەنگێك بەرز بۆوە:

- یەکەی چەترباز کاری چییە؟
- یەکەی چەتر باز؟ ئەمە یەکەیێکی ناجێگیرو جەنگیە، کە لەجێگایەکدا فڕێ دەدرێنە خوارەوەو یا دەنێردرێ و تا فرمانێکی تایبەتی و گرنگ ئەنجام بدا، تێگەیشتن؟

بێدەنگیەك باڵی بەسەر پۆلەکەدا هێنا.

- تین عەلیۆف پتر روونی کردەوە و گوتی:
- یەکەی یان بەتالیۆنی چەتر باز رەنگە لەچەند کەسێك یان چەند هەزار کەسێك پێك بێ، گرنگ ئەوەیە، کە یەکەی چەتر بازان دەچنە دواوەی دوژمن و پشتیان لێدەگرن و کاری خۆیان دەکەن. ئەگەر دەشتانەوێ زێتر بۆتان روون بکەمەوە ئەوا جارێکی دیکە بۆتان باس دەکەم. با ئێستا خەریکی کاری خۆمان بین. ئاناتای دانیشە، بۆ وەستاوی؟ باوکی تۆش لە بەرەی جەنگدا دەجەنگێ.
- باوکی منیش.
- باوکی منیش دەجەنگێ.
- باوکی منیش
- باوکی منیش.

تین عەلیۆف دەستی وا بلند کرد وەك بلێ، ببڕێتەوە، و گوتی:

- منداڵینە، من هەمووی دەزانم وابیر نەکەنەوە، کە من لە بەیانییەوە تاشەو تەنیا بەکاری کۆڵخۆزەوە خەریکم من هەموان دەناسم. کێ لەناو لەشکر و سوپایە، کێ لە نەخۆشخانەی چۆلەوانی و بیاباندایە، من ئێوە هەموتان دەناسم هەر لەبەر ئەوەشە هاتوومەتە لاتان. کەواتە ئاناتای تۆش دەچی بژێوی بۆ باوکت ئامادە بکەی، تۆش دەبێ ساڵێك یان لە ساڵێك زیاتر لەقوتابخانە بگەڕێتەوە.
- منیش! منیش، منیش هەروەها.

چەند کەسێك لە قوتابیان وایان گوت، وەهەر یەکێکیشیان لەم کات و سەرو بەندانەدا، خۆی بەکەسێکی قارەمان دادەنا. هیچ دەرفەتێك لەمە باشتر نییە؟

ناچێته قوتابخانەو کار بە ئەسپان دەکەی، ئەدی چیت دەوێ، لەمە باشتر هەیە؟

سەرۆکی کۆڵخۆز گوتی:

- نا، نا ئارامتان بێ: ئەوها نابێ. تەنیا ئەوانەی، کە سەروکاریان لەگەڵ گاسندا هەیە. تۆ ئارکین بەگ، تۆش دێبەرەی سەوزەو تەڕەت کێڵاوە؟ باوکت لەنزیك مۆسکۆ کوژراوە، من ئەمە دەزانم، باوك و برایەکی زۆر کوژراون. ئارکین بەگ، من تکا لەتۆش دەکەم هاریکاریمان بکەی. تۆش پێویستە لە جیاتی خوێندن بە جووت و کێلانەوە خەریك بی. چارەیەك نییە و من خۆم ئەمە بۆ دایکت روون دەکەمەوە.

سەرۆکی کۆڵخۆز دوایی ناوی دووکەسی دیکەی هێنا، ئارگیش و قوباد قول، و گوتی، کە سبەینێ سەر لەبەیانییەکەی هەمویان لەحەوشەی کادین و ئستبلی ئاژەڵەکان بۆ چاوپێکەوتنی بەیانیانەو دابەشکردنی کارو فرمان سەردەستەکان ئامادەبن.

سوڵتان مراد شەو درەنگانێ لەماڵەوە بەرلەوەی بنوون مەسەلەکەی بۆ دایکی باس کرد.

دایکی بە بێدەنگیەکەوەو بە ماندویی دەستی بە ناوچەوانی خۆیدا دەکێشا گوێی بۆ قسەکانی سوڵتان مراد راگرت. ئەو بە درێژایی رۆژ لە کۆڵخۆزدا کاری کردبوو، لە کێلگە بووەو شەویش بە کاروباری منداڵەکانی راگەیشتبوو، حاجی مرادی هارو هاج و شێت و شور بەخۆشی و شادیەوە گوتی:

- ئای، کە چەندە باشە. مرۆڤ نەچێتە قوتابخانەو بەسواری ئەسپەوە خەریکی جووتکردن بێ، منیش حەزم لێیە و ئەوەم دەوێ.

دایکی لەدڵەوە لێی پرسی:

- ئەرکەکانی خۆت جێبەجێ کرد؟

حاجی مراد وەڵامی داوە:

- بەڵێ.

- برۆدەی، بنو، دەنگت لێوە نییە، تێگەیشتی یان نا؟

بەڵام قسەیەکی بە کوڕە گەورەکەی نەگوت. و تەنیا لە پاشدان، دوای ئەوەی کچۆڵەکانی خستە ناو جێگاو بەرلەوەی فو لەچرا بکا، لەبەردەم چراکە زۆر دڵگیر بوو وایزانی سوڵتان مراد خەو بردوتیەوە. ئەوکاتە سەری خستە نێو دەستەکانی و گریا، ماوەیەکی زۆر بەبێدەنگی گریا و لە حەژمەت گریانەکە شانە لەڕو لاوازەکانی تەکانیان دەخوارد سوڵتان مراد دڵی توند بوو، ویستی هەڵسێ و دڵی دایکی بداتەوەو هێمنی بکاتەوە بەڵام نەیوێرا نارحەتی بکاو بیری

کردەوە، کە بەتەنیایی وازی لێ بێنی چونکە ئێستا بیر لەباوکم دەکاتەوە کە، ئێستا ئەو لەناو جەنگـدا لــە چ بارێــك دایــە. لــەبیری منداڵەکانیشــدایە، چــوار منــداڵ، بــیری مــاڵ و پێداویستییەکانی دیکەشی لە مێشکدایە.

ژن، ژنە، گریان بۆ ژنان رەوایە. خانمی مامۆستا، ئینکەمال ئاپایش دوای ئەوەش، کە تـین عەلیۆفی سەرۆکی کۆڵخۆز لە پۆلەکە چوەدەر، روی زۆر ترش و تاڵ بوو و خەیاڵی رۆیشـتبوو. کە زەنگیشی لێدا ئەو هەر لەپشت مێزەکە دانیشـت و نەچـووە دەر. هـەموو قوتابیـەکانیش دانیشتن و هیچ یەکێکیان رایان نەکردە دەرەوە، چاوەڕێ بوون تا خانمی مامۆستا لەجێی خـۆی بڵند بوو و بەرەو دەرەوە چو، کە گەیشتە ناو دەرگا گریا. هـەوڵی دەدا خـۆی راگـرێ و بـەڵام نەیتوانی و بەچاوی فرمێسکاویەوە رۆیشت میرزا گوڵیش کە نەخشە جوگرافیە لەبیرکراوەکەی بردە ژووری مامۆستایان بەچاوی بەگریان و فرمێسکەوە، گەڕاوە.

ئەمە کاری ژنانە، خەم لە هەموو شتێك دەخۆن لەبەر ئەمەشە دەگریەن. مەگەرچی بووە، شتێکی گرنگ نییە، ساڵێك یان زۆر زۆر دووساڵی دیکە جـەنگ دەبڕێتــەوە، دەکـرێ دیســان بچنەوە قوتابخانە... . .

سوڵتان مراد بەدەم ئەو بیرکردنەوانە و گوێ هەڵخستن بۆ گڤەی باو تێکهەڵاتنی بـەفر لـەو دیو پەنجەرەوە، خەو بردیەوە.

بەیانییەکەی رۆژی دوایش هەر بەم جۆرە با هەڵیکردبوو و باو و بۆران تەواوی ئەوناوچـەی داگرتبوو، ئاسمان بە هەوری رەش و تاریك داپۆشـرابوو. سـوڵتان مـراد تاگەیشـتە حەوشـەی تەویلە رەقێتەی گەیشتێ. کارێکی، کە سەرۆکی کۆڵخۆز هێنابوویە پێشەوە زۆر لەوە بەگرفت تر بوو کە دوێنی سوڵتان مراد بیری لێ کردبۆوە. یەکەم، لەگەڵ سەرۆکی کۆڵخـۆز و چکیشـی پیرەمێردی لەڕولاوازی ریش خەنەیی، کە هەریەکێك لـە قوتابیـەکان چـوار ئەسـپایی لغـاوی ئەسپی دانێ و بەرەو تەویلە کۆنەکە رۆیشتن لەوێدا لەحەوشە پڕ بەفرەکەدا ئەسپ و بارگیرەکان بە حاڵێکی سەرما بردوو و خەماویەوە دەهاتن و دەچون و لەئاخوڕە نیوەخالیەکان بەبێ دڵی و نا بەدڵی و تێماوییەوە کایان دەجوی. ئاشکرایە، کە ئەسـپ هاوینـان قەڵـەو و زسـتانان لـەڕ دەبن، بەڵام ئەم بارگیرانە تەنیا هەر پێست و ئێسقان بوون هەرکاریان پێکردن و رەتانـدیانن و کە زستان داهات یەکسەر بردیانە حەوشەی ئاخوڕێ کەس نییە ئالیکیـان بـدا و چـاوەدێریان

بکا ئالیکەکەیان بەئەندازەی مەمرەو مەژییە. هەرچیەکی ماوەتەوە بۆ وەختی جووت و کێڵانی بەهارێ هەڵگیراوە.

قوتابیەکان بەنائومێدی و تێکشکانێکی تەواوە وە راوەستابوون. چکیشی پیرەمێرد بۆڵەیەکی لێوەهات.

- چیە وا تێماون و واقتان ورماوە، واتاندەزانی تۆلپارەکانی ئۆردوی ماناس[21] چاوەڕێتان دەکەن لەم لایەوە هەڵبژێرن؟ مەترسن، هەڵە ناکەن. ماوەی بیست رۆژان هەریەکێك لەئێوە وەك جوانەگا، هێز و تواناتان دێتەوە بەرێ. جێی گومان و دودڵی نییە، ئەسپەکان زۆر بەتاو و توانان. ئەوان تەنیا پێویستیان بە خۆراك و چاودێریە، ئەویدیکە لەسەر خۆمانە.

سەرۆکی کۆڵخۆز زیاتر گوتی:

- منداڵینە بگرن. هەر چ شتێکی، کە پێوستتان بێ بۆتان دابین دەکەین، یا ئەڵلا دەی دەست پێبکەن هەر کەسەتان چوار دانە وەرگرن، هەر کامێکی، کە دەکەوێتە بەردڵتان بیگرن.

لەم کاتەدا شتێکی لەپڕ رویدا لەنێوان ئەو ئەسپ و بارگیرە بێ سەرپەرشت و پەرپوتانە ئەسپەکانی باوکی سوڵتان مراد ـ چاپدار و چونتور و دەخولانەوە. سوڵتان مراد یەکەمجار چاپداری ناسیەوەو لەرەنگەکەیەوە ئەوی ناسیەوە لەدواییشدا چونتوری ناسیەوە ئەوان کەللەستورو سەر و گوێلاگ تێك ئالاو و پەریشان و مات و داماو لەسەر چوار پەلە لاوازەکانیان وەستابوون، پاڵت پێوە نابان بەلا دادەهاتن.

سوڵتان مراد چەند خوشحاڵ بوو ئەوندەش دلگیر یەکسەر ئەوەی بەبیرداهاتەوە، کە چۆن لەگەڵ باوکیدا چونە شار ئەوساکە ئەوانە لە دەستی بابیدا چ ئەسپێك بوون و ئێستا چۆنن. ئەوساکە چاپدارو چونتور و چەند بەدڵنیایی و خوراگرییەوە عارەبانەیان رادەکێشاو چەند پتەو و بەهێز بوون، سوڵتان مراد هاتەوە کن سەرۆکی کۆڵخۆز و سەردەستەکەیان و دادو بێدادی کرد:

- هەی دادو بێداد، ئەمانە ئەسپەکانی باوکمن چاپدار و چونتوروون، ئەها هۆوانە!

چکیشی پیرەمێرد دووبارەی کردەوە:

- راستە، وایە. ئەوانە ئەسپی (بەکبای) بوون.

---

(٢١) تۆلپار: ئەسپی خۆشرۆی بەغارو هەماسی، ماناس قارەمانی داستانێکی حەماسی میللی قەرگیزیە. وەرگێرە فارسیەکەی.

سەرۆکی کۆڵخۆز گوتی:

- ئێستاکەوایە و ئەسپەکانی باوکتن، بۆخۆتیان ببە.

سوڵتان مراد سەرەڕای دوو ئەسپەکەی بابی جووتێکی دیکەیشی، کە یەکێکیان کلك سپی و ئەویدیکە قاوەییەکی تاریك بوو، هەڵبژاردو، بوون بە چوار ئەسپ بۆ گاسن سەروزیاد بوو. هەموو منداڵەکانی دیکەش بۆ خۆیان سەرو چوار ئەسپیان هەڵبژارد.

لەوێوە ئەو کارە دەستی پێکرد کە لەبەر خاتری ئەم کارە لە زستانی ساڵی ١٩٤٣دا منداڵەکانیان لە مەکتەب دەرهێنا... .

کار لەوە زۆتر بوو، کە چاوەڕێیان دەکرد، دەبوایە لەکاتی خۆیدا بەکارەکانی تەویلە رابگەن و سەرەڕای ئەوەش هەموو رۆژێك بۆ کۆمەککردنی بارپی، پیرەمێردە ئاسنگەرەکە بۆ چاککردنەوەی گاسنەکان بچنە ئاسنگەری. دەبووایە لە دواییدا بەم گاسنانە زەوی بکێڵرێ ئەوەی، کە پێشتر وەك پارچە ئاسن و ئاسنەوێڵەی بێکەڵك تووڕ درابوون. ئێستا ناچاربوون دیسانەوە پارچەکانیان لە ژەنگ و پیسی پاك بکەنەوە هەتا ئەو کۆنە گاسنانەی کەوا کاری خۆیان کردبوو، دیسان سەر لەنوێ خرانەوە کار. ئاسنگەرەکان ئاسنیان دەکوتی، لێوارەکانیان تیژ دەکردەوە، لەناو ئاگرو ئاودا جۆشیان دەدانەوەو ئاودار دەبوونەوە هەر گاسنێکی نەدەکرا بەباشی و وەك پێویست بکوترێنەوەو ئامادە بکرێن، لەبەر ئەمە هەرجارێك، کە ئەم کارە رویدەدا بارپی ئاسنگەر جەژنی بوو لەم بارانەوە ئەو چەکوچ وەشێنی ناچاردەکرد، بچێتە سەربان ومنداڵەکان لە حەوشەی تەویڵە بانگ بکا.

چەکوچ کارە شەلەکەش بەم شێوە بانگی دەکردن:

- هۆ هۆ جووتکاران ڕاکەن وەرنە ئێرە، وەستاکاری پێتانە.

منداڵەکانیش رایان دەکرد و دەهاتن. ئەوجار پیرەمێرد لە تاقۆکەی کارگە گاسنێکی، کە تازە تەواو و ئامادەکردبوو، هێشتا هەر داغ بوو، زۆر گران ورەشو خۆڵەمێشییەکی تێر بوو دەسیدەدایەو دەیدا کەسیك، کە نۆرەی ئەو بوو، گاسنی یەدەگ وەرگری و دەیگوت:

- وەرە ئاگادار بە. بگرە، بگرە دەی، تەماشاکە. بڕو پاڵ ئاسنە کەوە ئەندازەی بگرە. ببینە چەندە باش دەخێویێتیێ! زۆر باشە! وەك. بوك و زاوا پێك دەگەن. لەکاتی جووتکردندا لە ئاوێنەی تاشقەند باشتر دەبریقێتەوە. دەتوانن خۆتان لە ناو گاسنەکەدا ببینن. رەنگە لە باتی ئاوێنەش بیدەنە کچەکان؟ دیاریەکی هەتا هەتایە دەبێ. ئێستا لێیگەڕێین با لەناو. دەلاقچەکە بێ. دوایی بیبەنە کێڵگە. جارێکی دیکە بۆ کەسێکی دیکە ئامادە دەکرێ، بۆ هەمووتان

ئامادە دەکرێ. کەس بێ گاسن ناهێڵێتەوە. بۆ هەر کەسێك سێ گاسنی جووتە دروست دەکەین. تەنیا کارێکی، کە دەروەستی نایەم ئەمەیە، کە ناتوانم ددان بۆ خۆتان ساز بکەم، دەنا هەموو شتێکی دیکە دەتوانم. ئاسنتان بۆ ئامادە دەبێ. ئێوە کوڕوکاڵینە لەسەر کێڵگە بە خێر و خۆشی یادمان دەکەنەوە. ئەم گاسنە کۆڵەگەی پشتی هەوجارە. هەموو شتەکانی دیکە بۆ گاسن دروست کراوە. هەرکە گاسن باش بێ، خەتی جووتەکەش باش دەبێ. هەرکە گاسن کول[٢٢] بێ، جووتەکەش بە کەڵك نایە. تێگەیشتن... .

بارپی پیرەمێرد پیاوێکی باش بوو. لە هەموو ژیانی دا هەر ئاسنگەر بوو، نەختێ حەزی دەکرد بە شان و باڵی خۆی دا هەڵ بڵێ، بەڵام لە کاری خۆیشیدا لێهاتو بوو. دەبوو زووزوویش سەر لە کارگەی زین دوورین بدا. چکیشی، سەردەستە ئەم فرمانەی دابوو و گوتبوی تا رێشمە و لغاو وکەل وپەلەکان بەسەری ئەسپەکانەوە بکەن. گوتبوی بەبێ رێشمە و ئەسباب کارێك ناکرێ. ئەگەر گاسن هەبێ و ئەسپیش هەبێ بە بێ ئەسباب بە کەڵك نایە. ئەویش راستە. لەبەر ئەمە هەر یەکێك هەر جۆرێکی دەیتوانی لە دروستکردنی زین و ئەسبابەکان یاری دەکردن تا پێشوەخت بە ئەسپەکانی خۆی تاقیان بکاتەوە.

بەڵام مەسەلەی هەرەگرنگ و سەرەکی ئەوەیە، بەباشی چاودێری وسەرپەرشتی ولاغەکان بکرێ. بە درێژایی رۆژ و لە بەیانییەوە تا رۆژئاوا بوون و درەنگانی شەو لەتەویلە دەسبەکاربوون و تەنیا شەوانە پاش ئەوەی دوا بەشە ئالیکیان بە ولاغەکان دەدا دەگەڕانەوە ماڵ. پێویست بوو هەموو دەم لە هەموو جێگایەکدا پەلە بگرێ.

ماوەکە سەرو بەر مابۆوە نەکەم و نەزیاد. دوا دواییەکەی مانگی رێبەندان بوو. مانای ئەوەیە بۆ بەهێزکردنەوەی ولاغەکان و ئامادەکردنیان نزیکەی سی یان سی و پێنج رۆژێکی مابوو. مەسەلەی ئەوەی، کە بارگیرو ولاغەکان تاوەختی جووت و کێلاَن داهاتن و سەرلەنوێی هێزو بڕشت بگرنەوە بەر خۆیان یا نا، ئێستا تەنیا پەیوەندی بە خودی جووتیارەکانەوە بوو. ئەسپ گانلەبەرێکی وایە، کە ئەگەر نووستیش دیسانەوە هەر دەبی ئاخۆڕەکەی ئالیکی لێنەبری.

بەگوێرەی حسابی تینعەلیۆف دوا دوایی مانگی ڕەشەمێ، کە زەمین بەفری لێدەچێتەوە دەبێ گاسن وهەوجارەکان لە ئەکسای بن. سەردمێك لەوسەردەمە کۆنانەی، خەڵکی لە

---

(٢٢) کول:کوێر. پێچەوانەی تیژ.

ئەکسای کشتوکاڵیان دەکرد. بەڵام لە دواییدا دیار نییە زەوییەکانی ئەکسای لەبەر چ هۆیێك بە بەیاری مانەوە. رەنگە لە بەر ئەوە بێ، کە ئەکسای دورەدەست و چۆل و لە مرۆڤ خاڵیە. جگە لەمەش رەنگە لەبەر ئەوەبێ زەویەکانی ئەوناوە بەچاو ناوچەیەکی زورگاوی دیارە. چکیشی سەردەستە دەیگێڕاوە، کە باوکی گوتویەتی:(جووتیار لەئەکسای یا دەکەوێتە سوالٚ یان بانگی خەڵك دەکا بێن بۆ دروێنە تا هەرەوەزی بکەن. بەر لەهەموو شتێك دەبێ سەروەخت تۆ بکرێ. دووەم لە بەرئەوەی لە ئەکسای بەروبوم بە بارانەوە بەندە. چکیش ئەوهای دەگوت.

تین عەلیۆف دەیگوت:(جووتیار هەمیشە بەتەمای خوا و پێغەمبەر کار دەکا بەڵام ئومێدبڕیش نابێ )تینعەلیۆف حسابی ئەمەشی دەکرد و بەم قسانە ورەی دەدا بەر جووتێران، بەو ئومێدەوە، کە بەختیان ئەگەر بیگرتبا و بارانی باش بباریبا لە ئەکسای بەرهەمێکی باشی گەنم هەڵدەگرنەوە.

رۆژان دەهات ورادەبردن. لەکۆتایی هەفتە ئەسپەکان بەشێوەییێکی هەست پێیکراو گیانێکیان هاتەوە بەر. هەندێ سووران و قەڵەو بوون. کارەکان خەریك بوو ئامادە دەبوون. بە رۆژ هەتا هەندێ گەرم دادەهات. وەك ئە وە بوو زستان نیازی هەبێ جل و جۆری خۆی کۆ بکاتەوە. لە بەر ئەمە بە رۆژ ئەسپەکانیان لەبەر بەرۆچکێ و لەسەر ئاخورەکانیان دەبەستنەوە. ئەسپەکان لەبەر هەتاو باشتر ئالێکیان دەخوارد و باشتر بەدڵ وهەناویان دەکەوت. هەرپێنج دەستە چوار ئەسپییەکە، پێکەوە بیست سەر ئەسپ(دەستەی زەبروەشێنی ئەکسای)لەیەك رێز لەدەم ئاخورێکی درێژ بەدریژایی دیواری تەویلەکە وستابوون. کوڕیژگەکان بۆ دیداری بەیانیانەی سەرەك کۆڵخوز هەریەکەیان لەتەنیشت چوار ئەسپەکەی خۆیدا وەستابوو. تینعەلیۆف خۆی نازناوی (دەستەی زەبروەشێنی ئەکسای) پێدابوون. بەم پێیەی سەردەستەو بارکێش ومەیتەرەکان ئەوانیان بە غەیری دەستەی زەبروەشێن و یا بەشێوەییێکی سادە و دەستەی ئاسایی ناوی ئەوانیان نەدەهێنا خەڵکی ئێستاکە کاتی بە بەر حەوشەی تەوێلە دا رادەبوون سەرێك خوار دەکەنەوە، تابزانن کاروباری (دەستە)کە لە چیدایە. هەموو خەڵکی ئائیل قسە لە بارەی دەستەی ئەکسایەوە بۆتە وێردی سەر زمانیان. هەمووشیان ئاگادار بوون، کە تینعە لیۆف، سوڵتان مرادی کوڕی بەکبای کردۆتە فەرماندەی دەستەکە. لە راستیدا ئەم کارە بەبێ بێنە و بەورە لەگەڵ ئاناتای نەهاتە دی. ئەو دەمودەست ناڕەزایی خۆی پێشان دا:

- بۆچی دەبێ سوڵتان مراد ببێتە فەرماندە. بەڵکە ئێمە ئەومان ناوێ !

سولّتان مراد بەم قسە ئاگری گرت و گوتی:
- ئەسلّەن من نامەویّ ببمە فەرماندە. ئەگەر دەتەویّ، خۆت ببە فەرماندە!
ئارکین بای و قوبادقول هاتنە ناوەوە وگوتیان :
- ئاناتای تۆ حەسودیت پیّدیّ!
- چییە، حەزناکەی؟ ئیّستا، کە گوتویانە سولّتان مراد فەرماندە بیّ، دەبیّ فەرماندەبیّ.
بەلاّم ئەرگیشی پشتیوانی لە لە ئاناتای کرد و گوتی:
- بۆ چی ئاناتای بەکەلّکی ئەم کارە نایە؟ ئەو بە هیّزە؟ تەنیا کەمیّك لە سولّتان مراد کولّەترە. لە قوتابخانە، ئیّمە خۆمان چاودیّری پۆلمان هەلّدەبژارد. وەرن با هەر بۆ خۆشمان فەرماندەی خۆمان هەلّبژیّرین. ئەگەر نا چیدەبیّ، سولّتان مراد، با سولّتان مرادبیّ.
تینعەلیۆف، کە بە بیّدەنگی گویّی بۆ قسەکانیان راگرتبوو لە کۆتاییدا زەردەخەنەیەکی هاتیّ و سەری بادا و لە پڕیّك خۆی جیدی و توند کرد:
- دەنگە دەنگ ببڕنەوە، وەرن لیّرە ریز بن، باشە. ئیّستا، کە ئیّوە هیّزی زەربەردەستن، دەستەیەکی بەراستی بن. گویّتان لیّ بیّ وەك ئالّقە لە گویّتانی کەن، کە فەرماندە هەلّنابژیّردریّ، بەلّکە بە هۆی سەرکردەکانی سەروترەوە دادەندریّ.
ئەرگیش هاتە ناو قسەکانی سەرۆکی کۆلخۆز و وتی:
- خودی سەرۆك کیّ هەلّدەبژیّریّ؟
- سەرۆکیّکی لەو گەورەتر.
- هەموو بیّدەنگ بوون.
سەرۆکی کۆلخۆز دریّژەی بە قسەکانی خۆیدا:
- منداڵینە. مەوزوعەکەمان ئەمەیە:جەنگ بەردەوامە و ئیّمە ناچارین بە مەرج و بڕیارەکانی سەردەمی جەنگ بژیەین. لەبەر چاوتان بیّ من لە هەمووتان بەرپرسیارم، بەرپرسیاریەتیەکی گەورەی کەبە هەموو هیّزی دلّ و گیانمەوە دەیگرمە ئەستۆ. دووکەس لە ئیّوە باوکیان کوژراوە، سیّ کەسی دیکەش باوکیان لە بەرەی جەنگن. من لە هەمبەر زیندووەکان و مردووەکاندا بەرپرسیارم. من ئەم بەرپرسیاریّتیەم لە بەر ئەوە گرتۆتە ئەستۆی خۆم لیّیان دلّنیام، کە چوونمان بەرەو ئەقسای دورەدەست بە خۆمان و کەلوپەلّی جووت و کیّلّەوە، لە پیّشە. شەو رۆژانیّکی زۆر وەك دەستەویەکە چەتربازەکان بە کاریّکی تایبەتی لە

دەشت و چۆلی بەسەر دەبەن. ئێوە چۆن لـەوێ دەتـوانن بـژین و کـار بکـەن ئەگـەر لـە سـەر هەرشتێك ناکۆکی پەیدا بکەن و دادوبێداد و دەمەقالە بنێنەوە؟

تینعەلیوفی سەرۆکی کۆلخۆز لە بەردەمی ریـزی منداڵـەکان لـە حەوشـەی تەویلـە ئـەم قسانەی کـرد. چـەتربازی پێشـو بـە هـەمان سەرچـاکەتە بێقۆڵـە سـەربازیەکەیەوە و کـڵاوە خۆڵەمێشیە سەربازیەکەی، بـە قیافـەتێکی نیگـەران و مکوڕیەکـەوە راوەسـتابوو و لەگـەل ئەوەشدا هێشتا هەر گەنج بوو و چەند دانە دەندە پەراسوێکی لـە دەسـت دابـوو و لار بـوو و جانتا خزمەتیە بیابانییەکەی وەك هەمیشە بە قەدەوە بوو.

تینعەلیۆفی سەرۆکی کۆلخۆز لە بەردەم ریزی دەستەی ئەکسای، کە سوڵتان مرادی کـوری بەکبای بە فەرماندەی ئەوان دانابوو ئەو قسانەی کردو و گوتی:

تۆ لەهەموو شتێك بەرپرسی. بەرپرسی کەسەکان، کەلوپەلی جووت و کێڵ. ئەسپ و زیـن و کەلوپەلەکانیان. تۆ بەرانبەر کێلاَن و جووتکاری لە ئەکسای لێت دەپرسرێتەوە. بەرپرسـێتی مانای ئەوەیە، کە فرمان و دەستورەکان ئەنجام بدەی. ئەگەر دەروەستیان نەیەی یەکێکی دیکە لە جێگات دادەنێین. ئێستا هیچ نارەزاییەك لە هیچ کەسێك قبوڵ ناکەین.

تینعەلیوف سەرۆکی کۆلخۆز ئەو رۆژە لە حەوشـەی تەویلـەدا لەبـەردەم ریزەبچـووکەکەی دەستەی ئەکسای ئەم قسانەی کرد.

جووتیارەکان وەفادارانە و بـە ئـارەزوو خۆشـیەوە تەماشـای پەیکـەری ئـەویان دەکـرد و ئامادەبوون هەموو

فرمانێکی ئەو جێبەجێ بکەن. ئەویش لە بەرانبەر ئەواندا وبگرە وەك خودی مانای بـەیاڵ وگۆپاڵی خۆڵەمێشی و قیافەتێکی ترسـناك و جلوبـەرگی زرێیـەوە وەسـتابوو منداڵـەکانیش بەرانبەر ئەودا وەك پاڵەوانانی وەفاداری ماناس قەڵغان لە دەست و شمشێر لە قەد دەهاتنە بەر چاوان. ئەو کورە ئازاو پڕ شانازیانە، کە مانای ئومیدەکانی خۆی و کارەکانی بەوان سـپاردبوو چ کەسانێك بوون؟

یەکەمین کەسێکیان گوردی بەناوبانگ سوڵتان مراد بوو. هەرچەندەی، کە لەوانیدیکە بـە تەمەنتر نەبوو و تەمەنی تەنیا پانزە سال بوو، بەلاَم ئەم سوڵتان مرادە کوری بەکبای بە هۆی ژیری و هۆش و دڵ و بوێریی خۆی بە فەرماندە دانرا. باوکیشی، کە باشترین باوکی دنیا بـوو. ئە و وەختەی لەناو لەشکرکێشی دەورەدەسـت و جـەنگێکی گـەورە بەشـداربوو. ئـەو چـابدار

ئەسپە چاپوکە بە هێزەکەی خۆی بۆ سوڵتان مراد بەجێ هێشتبوو. سوڵتان مراد برایێکی بچوکیشی هەیە، کە حاجی مراد ئەو برایەکەی زۆر

خۆش دەویست. هەر چەندە کە حاجی مراد ئازاری دەدا. سوڵتان مراد لەسەر ئەمانەشەوە بەنهێنی میرزا گوڵ بیکچ، ئەو کچۆڵە جوانکیلەی خۆش دەویست. لە هەمووی خۆشتر پێکەنینی میرزاگوڵ بیکچ بوو.

بالآی چەند رێك و جوان بوو، وەك ئەسپنداری ترکستان، پێستی دەموچاوی وەك بەفری سپی و چاوەکانی وەك ئاگرێك بوون، کە لەشەوی تاریك و تنۆکدا لە ناو چیا هەڵکرابێ... .

ئازاو دلێری دووەم ئاناتای پاڵەوانی پڕ لە شانازی بوو، کە لە ناو دەستەکەدا لە هەموان بە تەمەنتر بوو و تەمەنی شانزەساڵ بوو. ئەو لە هیچ لایەنێکەوە لەوانیدیکە بێتواناتر نەبوو، جگە لە بالآی، ئەویش هەر هێندەی کەمێك. لە جیاتی ئەوەش لە هەموان بەهێزتر بوو. ئەسپی ئەو هەر بەمشێوە، کە خۆراکی پاڵەوانانە - ئوکتو ر - مانای- تیری سوور- ناوی بوو. باوکی ئاناتای لە جەنگی گەورەش و لە چالاکیە سەربازیە دورە دەستەکانیش بەشداربوو. ئاناتای هەمان کچۆڵەی نەشمیلانەی وەك مانگی تابان- میرزاگوڵ بیکچ-ی لە دڵی خۆیدا خۆشدەویست و بە چاوەڕوانی ماچێکی ئەو کیژۆڵەدا لەسەر ئاگرو پەنگران بوو.

پاڵەوانی سێیەم ئارکین بەگ قارەمانێکی، لاو و سەرنجڕاکێش بوو و کوڕە گەورەی خێزانەکەی بوو. ئەو دۆستێکی باش و بە وەفابوو. ناوناوێك بە خەمباریەوە ئاخی هەڵدەکێشا و بە دزیەوە دەگریا. باوکی لە ئۆپەراسیۆنە جەنگیە، دورەدەستەکان لەکاتی بەرگریکردن لە مۆسکۆ دلێرانە شەهید بوو. ئەسپە پڕ هێز و کوڕەکەی ئارکین بەگ، کە شایانی پاڵەوانانە بە ئاکبای پاکی کوکوك یعنی ئەسپی بەغاری وەك بای (گۆرەوی سپی) ناویان دەبرد، پاڵەوانی چوارەم ئارگشی قارەمان بوو. ئەویش لە خەسڵەتی دۆستایەتی و هاوڕێیەتی بەرخوردار بوو. تەمەنی پانزە سال بوو و حەزی بە دەربرینی بیروباوەڕەکانی خۆی دەکرد و خۆیشی دەکردە ئەسکوی هەر دیزەیەك، بەڵام لەکاروکردەوەدا جێگای باوەڕپێکردن بوو. باوکی ئەویش لە جەنگی گەورە و دورەدەستدا بەشدار بوو، ئەسپی ئەو هەمانشێوە کە شایانی پاڵەوانان بوو ناوی- ئالتین تویاك- سم زێرین بوو.

لە نێو ئەو پاڵەوانانەدا پاڵەوانی پێنجەمیش هەبوو. قوباد قولی قارەمان. ئەویش پانزە ساڵی تەواو کردبوو. لە خێزانەکەی دا لەهەموان گەورەتر بوو. باوکی قوباد قول لەئۆپەراسیونە جەنگیە دورەدەستەکانی ناوجەنگەڵەکانی بیلاروسیدا ئازایانە و سەربەرزانە شەهید بوو. قوباد

قول زەحمەتکێشێك بوو نەیدەزانی ماندوبوون چیە و وەك هەر پاڵـەوانێك ئەسـپە چـالاکەکەی خۆی بەناوی ژیبك ژال یەعنی ئەسپی باڵ ئاوریشمی زۆر خۆش دەویست. پاڵەوانانێکی ئـەوها لـە بـەردەم تینعەلیوفـدا وەسـتابوون. لەدواوەیانـدا، لـەو دیـو شـانە لاوازەکانیـان، پشـتە سەدەکانیان، کە لەسـەر ملـە باریکەکانیانـدا چەسـپابوو بەدرێـژایی ئاخوڕەدرێژەکـە ئەسـپە چوارچواریەکانیان- پێنج تاقمی چوارتایی یەعنی بیست ئەسپ راوەستابوون، کە دەبووایە بـە گاسنە دوودەمەکانەوە ببەسترێنەوە وبۆ ئەکسای دورەدەست دەچمان. لە ئەکسای، لە ئەکسـای هەر لەگەڵ ئەوەی بەفر دەستی بە تاوانەوە بکردبا، دەبووایە دەست بە جووت و کێلان بکـەن. لە ئەکسای، لە ئەکسای هەر کە زەمین هەناسەی داوکزر بـوو، دەبـێ کـاری گاسـنان دەسـت پێبکا، بەڵام هێشتا بەفر لەهەموو شوێنێکدا هەبوو. ئەو بەفرەی بەسەریەکدا کەڵەکـە ببـوو هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو رۆژانە نزیـك دەبوونـەوە و هـەموو تەدارەکێك بۆ ئەو رۆژانە ئامادە دەکرا.

٥- ئەو رۆژانە دادەهاتن...

ئەو ئەسپانەی بۆ جووت وکێڵـی ئەکسـای ئامـادە دەکـران نازنـاوی جیاجیایـان هـەبوو. هەندێك بە ئەسپەکانی دەستەی زەبروەشێن و هەندێکی دیکەیان بە ئەکسایی بـانگ دەکـرد، بەڵام بە هەموو شێوەییێك راستی ئەوەبوو، کە لە قەدرایی دوو هەفتەی دوواییدا، ئەوان لەگەڵ ئەسپەکانی دیکەی تەویلەدا جیا بوون. ئەسپە ئەکسابییەکان تێرو پڕ و پاك و خاوێن و بەیـەك ریز بەدرێژایی تەویلەکە وەستابوون و چاوی مرۆڤ بە هێزی ماسولکەکانیان روونـاك دەبـۆوە و چێژی لە دیمەنی شادی و گوێیە موچ[٢٣] وهەستدارو تیـژەکانیان دەبینـی. لەوانـدا خەسـڵەتی ئەسپی بەخەبـەر و هـەرکامێکیان سـەرلەنوێ خاسـیەتە لـە دەسـتداوەکانی خـۆی بەدەسـت هێنابۆوە. خو و خاسیەتە لەبیرکراوەکانی ئەوان کەسەریان هەڵداوەو بوژانەوە. ئیدی ئەسپەکان هۆگری خاوەنە نوێیەکانیان بـوون و، لەسـەرەخۆ و رێـك وەك لـەژێرلێوەوە، بـە میهرەبـانی، لەحالێکدا سەری خۆیان بەرەودەنگەکان و هەنگاوەکانی ئاشنایان دەسووراندەوە، دەیانحیلاند و دەم و لموزە نەرمۆڵەکانی خۆیان درێژ دەکرد. منداڵەکانیش هۆگریان ببوون و ئێسـتا بانگیـان دەکردن و تا ژێر تەنگەی ئەسپەکان دەچون(یائەڵڵا، قاچت ببە دواوە! ڕاوەستە ڕاوەستە!

---

(٢٣) موچ: تیژ-قولاغ

هەی کەللە خڕ، پەلە مەکە! چاوچاو سەری دێنێتە پێشەوە، ماستاو دەکا، کلاوچی! وەرە! هەی گێژە! من تەنیا تۆم نییە! ئەسپی دیکەشم هەیە).

ڕۆژانی یەکەم ئەسپەکان بەشەلەشەل و وەك نیوە کوێر بن، بەرەو سەر جۆگا بۆ ئاو خواردنەوە دەچون. دوایی دەستیان بە یاری و جلیتبازی کرد. بەتایبەتی کاتێك لە سەر جۆیبار دەگەڕانەوە. ئەوانیان پێکەوە بۆ سەر ئاو دەبرد و هەریەکێك لە منداڵەکان سواری ئەسپی مونتازی خۆی دەبوو. سوڵتان مراد سواری چابدار، ئاناتای سواری ئوکتورو، ئارکین بەگ سواری ئاك بای پاك، ئەرگش سواری ئاڵتین توباك و قوبادقول سواری ژیبك ژاڵ دەبوون. ئەوان بەوناوەدا چەرخەلەیان بەهەموو ئەسپەکان دەدا و بۆ سەر ئاویان دەبردن. دەبێ زستان باری سەر ئاوەکە باشتر بکرێ و ڕێك بخرێ، ئاگادار بیت پێش و بەردەمی ئەسپەکان نەیبەستێت و سەرئاوەکە نەبێتە خلیسك. بەتایبەتی کاتێك، کە ئەسپەکان پێکەوە بەرەوە بیانەوێ ئاو بخۆنەوە. لە بەر ئەمە پێویستە، کە پێشتر ئەم لاوئەولای زەمینی دەوروبەرەکەی سەرئاوەکە هەڵکەندرێن و جێگا بەترسەکان کایان پێوەر بکرێ. لەگەڵ ئەمەشدا لە ڕۆژی زۆر ساردا شوێنە شەختاویەکان بشکێنرین و کونیان تێکرێ. سوڵتان مراد لەمبارەوەش کێشکچی ڕێك وپێکی داناو دیاربوو، کە دەبێ کێ و لە چ ڕۆژێکدا سەر ئاوەکە بۆ ولاغەکان ئامادە بکا.

ئەسپەکان بێ پەلەپەل و بەبێ پاڵەپەستە لەژێر چاودێری جووتێرەکانی داهاتوودا ئاوێکی سازگارو ڕەوان و تەزیویان دەخواردەوە. ئاو لەژێر چینی شەختەوە دەڕژایە سەر چەوەلانەکە و دەچۆوە ژێر شەختەکەوە و لە ژێر شەختەکەشدا هاژەو خوڕە خوڕێکی دەهات و لەژێرەوەش بەر سایپتەی توێژە شەختەکە دەکەوت...

ئەسپەکان وەك گوێ ڕابگرن بەپشو ئاویان دەخواردەوە و لەژێر پرشنگی کەم تینی هەتاو کەمێ گەرمیان دەبۆوە و سەرلەنوێ بینیان بەئاوەکەوە دەناوە. دوای تێر ئاوبوون لەسەرەخۆ دەهاتنەوە سەرجادە و کاتی گەرانەوەیان بۆ تەویلە دەستیان بەیاری و جریتبازی دەکرد، بەپڕمەپڕم کونە لوتەکانیان فش دەکردەوەو مووی کلکەکانیان دەهێنا و دەبرد، (سمکۆڵیان دەکرد و هەڵدەستانە سەر هەرچوار پەلەکانیان. منداڵەکان جارێکیان بەدەوری ئەواندا ڕایاندەکرد و جارێکیدیکەیان ئەسپەکانی خۆیان کۆ دەکردەوە وزاق و زریقیان دەناوە. دوای تێپەڕینی چەند ڕۆژێك خەڵکی بۆ تەماشاکردنی ئەسپە تایبەتیەکانی ئەکسای دەهاتن. وەك ئەمەبوو، کە ئەم ئەسپانە ئەوەکانی جاران نەبن و تازەبن. پیرەمێردەکان بۆ دانی بیروڕای خۆیان سوودیان لەهەر دەرفەتێك دەبینی، کە لەدنیای گیانلەبەراندا میهرەبانتر و

سەرنجڕاکێشتر لە ئەسپ نییە ئەوە بە مەرجێك، کە لەدەستی میهرەبـان و بـەکاردابن ئەگـەر مرۆڤ بە ئەندازەی سەرەنینۆکێك چاکەی لەگەڵدا بکا، ئەو سەدقات پتر چاکەی دەداتەوە و زۆر رووداوی جیاجیایان لەم بارەوە دەگێڕاوە.

تەنیا تینعەلیوفی سەرۆکی کۆڵخۆزی دەکەوتە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکانە. ئـەو بەچـاوێکی جدی و رەخنەگرانەوە بەر لەهـەموو شـتێك لەئەسـپەکان و دەسـتەی زەبروەشـێنی دەنـۆڕی و دەپشکنی و دەیویست بزانێ، کە گاسنەکان، زینوجل و ئەسپابیان ئامادەن یان نا، ئەدی بۆچی سەرچۆکەکانیان هەڵزڕاون و کونی سەر چۆکەکانیان پینە نەکراون و دەیگوت:کاتێ، کە دایکت ناپیەرژێ و پیڕاناگا، ئایا گرفتێکی گەورەیە خۆت دەرزی و داوبگریتە دەست؟ و ئەدی جلەکان کەی ئامادە دەبن؟

ناکرێ تەویلەکە لەگەڵ خۆماندا ببەینە ئەو دەشت وئاقارە ساردەی ئەکسای.

ئەو بەخێرایی بـەبیرِ منداڵـەکانی دەهێنـاوە و ئاگاداریدەکردنـەوە، کـە کاتەکـە تەنگـەو هێندەیان لەبەر نەماوە ئەوکارانەی، کە دەبێ لێرە بکرێن، نـاکرێ لەئەکسـای ئـەنجام بـدرێن. هەندێك جاران کارەکە دەگەیشتە دادو هاوار و ناو بژیکاری و وەختێك عارەبانچـیەکان لـەناو عەرەبانەی وێنجەی وشك، کـە بـەڕادایی بـۆ ئەسـپەکانی جـووت و بەپلـەی یەکـەمیش بـۆ ئەسپەکانی ئەکسای هەڵگیرابوو لەکاتی خۆیدا باریان نەدەکرد چکیش(سەردەستەکەیان)لۆمەی دەکردن. دایکانیش لەم بارەدا جۆش و خرۆش و خۆشحالی خۆیان بەدیارنەدەخست. جارێکیـان دایکـی ئـەم و جارێکیـدیان دایکـی ئـەو دەهـات بەسـەرکۆنەکردنەوە دەیگوت:(ئەمـە چ نالەبارییەکە؟ کێ ئەم دەستە زەبردەرەی بۆ ئێمە داهێناوە، بەراستی شتی ئاوهـا نـەدیتراوە و نەبیسـتراوە. پیاوەکانمـان، کـە هـەموویان چـوونەتە جـەنگ هێشـتا کـەم بـوون!؟، ئێسـتا کوڕەکانیشمان وەك سەربازیان لێهاتووە نە دەکرێ بۆ کـاری ماڵـەوە سـوودیان لێـوەربگیرێ و نەکەسێك هەیە بتوانین دەردە دڵی خۆمانی لا هەڵبڕێژین، لە سبەینەی سالحانەوە تا شەو دادێ تەنیا لەناو تەویلەدا خەریکن... .

و زۆر قسەو بۆڵەبۆڵی دیکەی، کە ئەگەر بیری لێ بکرێتەوە، راست و رەوا بـوون. سـوڵتان مراد بەر لەهەموان کەوتۆتە ناو دەردە سەری و گیرۆدە بـووە. دەبووایـە هـەر ئاوهـاش بـێ، چونکە سەردەست بـوو. ئـەو بەرپرسـیارێتی بەرانبـەر هـەموان هـەبوو. بـەڵام لەهـەمووی بەگیروگرفتری ئەو بەرپرسیارێتیەی بەرانبـەری دایکـەی بـوو. دایکـی خـۆی ئیـدی کـارێکی بەسەریەوە نەبوو، ئەو ئیدی ماندوو ببوو:(تەنیا باوکی بەزیندوویـەتی لـە جـەنگ بگـەڕاباوە

هیچی دیکەی نەدەویست، تەنیا کە ئەو خۆی سەری لەکاری خۆی دەردەکرد. ئیدی بۆ من بەسە. کوڕە شیرینەکەم تۆ تەنیا کاتێك بەخۆت دێیەوە، کە پێیەکانم بەرەو قیبلەگا درێژ دەکەن. ئەوکاتەش ئیتر درەنگە... )سولتان مراد دلی بەدایکی دەسووتا، زۆریشی دڵ پێدەسووتا، بەلام هیچی لەدەست نە دەهات، لەراستیشدا هەرکەسێکی دیکەش لەجێگای ئەو دەبوو، نەیدەتوانی شتێك بکا. هەر یەکێك لەدەستەی زەبروەشێن چوار ئەسپ و زۆر کاری دیکەشی هەبوو. جگە لەمە دەبوایە ئاویان بدا، پاکیان بکاتەوە، ئالیك ئامادە بکا و سەرلەنوێ ئاویان بداتەوە، ئالیکیان بداو خاوێنیان بکاتەوە، تەرس و پاشەڕۆکیان بباتە دەرەوە و دەبوو هەموو رۆژێك ئەم کارە بکەن... ئەم شوشتن و دەرمانە پەڵەو پیسیە کۆنەکان و برین وڕووشانی شانەکان و پشت گەردەنی ئەسپەکان چەندەی پێدەویست. پزیشکی ئاژەلانی ناوچەکە هەموو جۆرە دەرمان و گیراوە و مەڵحەمێکی بۆ بەجێهێشتبوون تاخۆیان چارەسەری ئاژەلەکانیانی پێبکەن. دەبوایە هەموو رۆژێك دەستیان تێوەیان بێ و دەرمانیان بکەن دەنا دەرمان نەدەبوون[٢٤]. دەبوو خۆراکی پێویستیان بدرێتێ و قەڵەو بکرێن، ئەوهایە، بۆدەرمانیش ئەسپێکی ساغیان تێدانەبوو. لاشانیان هەمووی هەر برین بوو. ئەسپ تێناگا کە دەیانەوێ چارەسەری بکەن. لەبەر ئەمە سەرپەرشتیکردنی زۆر زەحمەت بوو.

وەختێکی ئەسپەکان گیانێکیان هاتەوەبەر و توانیان لەسەر چوارپەلان گیربن، پێویستیان بە راهێنانەوە بوو. دەبوایە هەموو رۆژێك هەرئەسپەی بۆ ماوەی یەك سەعات و نیو چوارناڵەیان پێبکرێ و تاو بدرێن ئەگەرنا بەدەردی چکیش گۆتەنی، لەکاتی راکێشانی گاسندا ئارەقەیەکی زۆر دەکەن و لە پەل و پۆ دەکەون. لەم سەروبەندانەدا رووداوێکی زۆر ناخۆش روویدا... .

هەر پێنج کوڕێژگەی پاڵەوان سواری ئەسپە باش و نایابەکانیان بوون و بۆ راهێنانیان لە تەویلە وەدەرکەوتن. سولتان مراد بەسواری چابدار، ئاناتای بەسواری ئوکتورو، ئارکین بەسواری ئاکبای پاك، ئارگش بەسواری ئالتین توباك و قوبادقول سواری ژیبك ژال بوون. ئەوان بەپێی عادەت ئەسپەکانیان تاودا، کە بەدەوری حەوشەی تەویلەدا سوورانەوە هاتنە سەرجادە و بۆ ئاقاری ئائیل چون و ئەوان لە گۆراییەکی بە بەفر داپۆشراو ئەسپەکانیان تاودا. رۆژێکی خۆشی هەتاو بوو و گەرمای تیشکی بەهاری هەستی پێدەکرا. سەرچیاکان سپی سپی دەچوونەوە

---

(٢٤) رەنگە مەبەستی ئەوەبێ ئەگەر هەمووڕۆژێك دەرمان نەکرابان ئاژەلەکان سودیان لێنەدەبینی.

ئەوەندە هێمن و رووناك بوو، کە ئەگەر مێشکیش لـە نشـێوە سـپیەکانیان بایـە، دەدیـترا و گیزەگیزی دەبیسترا. زستان مۆڵەتێکی دابوو ئارامی گرتبوو. ئەسپەکان بـە زەوق و شـادیەوە غاریان دەدا و بۆ چریتبازی بێهێز بوون. سوارەکان جڵەویان شل کردبوو و خێـراو تیـژ وەك بـا تاویان دەسەند. حەزیان دەکرد چوارناڵە بکەن. سوڵتان مراد لـە پێشـەوە و ئاناتـا لـەدواوەی بۆلەبۆلی بوو:

- دەی خێراتر برۆ. بۆ هێندە لەسەر خۆی.

بەڵام سوڵتان مراد هەر وەك فەرماندە زۆر رێگای نەدەدا خێراتر بکا.

نە نەرمەغار بوو نە تاودان. ئەم کارو راهێنانە بۆ ئەسپەکانە تـا لەپاشـدان جـووتکردن و کێڵانیان لەکن زۆر گران نەبێ. هەموو دەستەکە ئەوها ئەسـپەکانیان لێـدەخوڕی. لـەگۆڕاییێك سوورانەوەو ویستیان بگەڕێنەوە لەسەر گردەکە دەنگێکیان گوێ لێبوو. ئەم دەنگە دەنگی ئەو قوتابیانە بوو، کە لەقوتابخانە دەگەڕانەوە، هەرکە ئەوان دەستە سوارەکەیان دیت، دەستیان بە هاوارهاوارو بەرزکردنەوەی دەستەکانیان کرد. دەستەکەش لـە وەڵامـی ئەوانـدا قریوانـدیان و دەستیان بۆ بەرزکردنەوە. پۆلەکەی ئەوان واتە پۆلی حەوتـەم و پۆلـەکانی دیکـە لەخوێنـدگا دەهاتنەوە. بەدەم دەنگە دەنگەوە بە رێگادا دەرۆیشتن. سوڵتان مراد لـەو نێوانـە ئـەو، واتـە میرزاگوڵی بەدی کردو یەکسەر ناسییەوە. چـۆن سـوڵتان مـراد ئـەوی بـەدی کـرد، ئەمـەیان خۆیشی تێینەگەیشت، بەڵام ئەو خۆی بوو. ئەوی لە دەم و چاو و روخساریەوە کە لەناو شاڵە بچووکەکەیەوە دەدیترا ولە بەژن و باڵاو لەنجەی رۆیشتنی و دەنگیەوە ناسیەوە. وادەهاتـە بـەر چاو کە ئەویش سوڵتان مرادی ناسـیبێتەوە. ئـەو بـەدەم گـوتنی شـتێکەوە بـانگی دەکـرد و جانتاکەی بادەدا لەگەڵ ئەوانیدیکەدا لە گردەکە بە راکردن نشێوە دەبۆوە. وەك بڵێ ی هاواری کرد(سوڵتان مراد)و هەروەك چۆن دەستەکانی بـەم لاوئـەولادا کردبـۆوە بـەرەو روی ئـەو رای دەکرد، بەڵام چۆن بەرەورووی دەهات، وەك ئەوەی گڕی گرتبێ لەمێشکیدا تۆمار ببوو.

تێگەیشت، کە تیکڕای ئەو رۆژانە لە خەیاڵ و بیری ئەودا بووە و دڵی بۆی تەنگ بـووە... لە خۆشیان وەك

ئەوەبوو کە شەپۆلێك ئەوی پێش خۆی داوە و هەر دەیباو دەیباو لوولی دەدا. دیـار نـەبوو بۆ ئەوها بوو، کە هەموویان بە چوارناڵە، بـەرەو گردەکـە هـاتن، کـە هاوپۆلـەکانیان لێـوەی دەهاتنە خوارێ و بەخێرایی گۆڕاییەکەیان بڕی و لە هەورازەکە سەرکەوتن. ئـەوان دەیـانتوانی بەدرێژایی ماوەی هەورازەکە بەتاو بچن و پاشدان پێکەوە بجمێن و پاشدان بچنە تەوێلەکـەوە.

سولّتان مراد وای دانابوو ئەوها بکا، بەلاّم لەم کاتەدا ئاناتای بەری لێگرتەوە. ئەسپەکەی ئەو ئوکتور و پڕ لە هێنزو توانا بوو.

سولّتان مراد هەرەشەی لێکردو وتی:

- بوەستە، بۆکوێ مل دەنێ ی، تاو مەدە، - بەلاّم ئاناتای هەتا ئاوڕیشی لێنەداوە.

ئەم بیرەی نامانووس ئاگری لە سولّتان مراد بەردا(هەبێ ونەبێ دەیەوێ میرزاگولّ ببینێ! )تووڕە بوو و نەیتوانی چیدی خۆی ڕاگرێ، ئەم کارە بەسەختی هانیدا و بەدوای ئەوەوە دەنگی چابداری داو های هوی ناوەو بەسەر باڵی ئەسپەکەیدا دەهاتەوە و بەدوای ئاناتای کەوت. ئاناتایش پتر لە ئەسپەکەی وەژەنی و ئەوان بە جۆرێکی وا لەگەل یەکدا کەوتنە پێشبڕکێ و پێش لەیەکگرتنەوە، تاکێ بەسەر کێدا سەرکەوێ و کێ زوتر بگاتە میرزاگولّ، یان کێ چاپوکی و نەترسی و پتر سوارچاکی خۆی نیشان بدا. ئەوان بە چ تیژییێك تاویان سەند! لە هەموو شێوەییێکدا بەدیار کەوت، کە چابدار بەهێزو گوڕترە. باوکی هەروا بە خۆرایی نەیدەوت، کە چابدار توانایێکی زۆر و زەبەندی بەزین و غاردانی هەیە. سولّتان مراد لەبەر ئەوەی وەك بای شەمالّ تاوی دەدا و خەریك بوو بگاتەوە ئاناتای، دلّ و گیانی سەراو رێژی خۆشی و شادی بوو! ئەو لەگۆشەی چاویەوە دیتی، کە تاقمە بە دەنگ و مقۆمقۆکەی هاوپۆلەکانی وەستان. بە تەماشاکردنی ئەو کێ بەرکێیەی، کە لەئارادابوو، ئەوان سەرقالّ بوون و لە نێوانیاندا میرزاگولّی دیت و باشیشی دیت، و بەتایبەتیش سەیری ئەوی دەکرد. لەراستیدا سولّتان مراد تەنیا لەبەر خاتری ئەو دەستیدا ئەم پێشبڕکێیە وخەریك بوو سەردەکەوت. لە بارێکدا لە ئاناتای پێش دەکەوتەوە لە هەورازی گردەکە رێچکەیێکی، کە کەمێ سەروتر بوو هەلّبژارد تا لە میرزاگولّ نزیکتر بێتەوە. لەم بارەوە، کە چابداری لە هێلّی رێچکە سەروترە، کە تاودا زۆر زۆری خۆشی لێهات و ئەگەر نا کێ دەیزانی، ئەنجامەکە چی دەبوو. لەبەر ئەوەی لە چرکەساتی دواییدا، کاتێك گەیشتەوە تەنیشت ئاناتای وئینجا پێشی گرتەوە و بەئەندازەی درێژاییی لەشی ئەسپەکە پێش کەوتەوە، شتێك لە ئاناتای رووی دا. هەمووی پێکەوە هاواریان کرد. سولّتان مراد لە حالێکداجلّەوی توند رادەکێشا سەیری دواوەی کرد- ئاناتای لەدواوە نەمابوو. سولّتان مراد ئەسپەکەی سەبر کردەوە و ئارامی کردەوە و گەڕاوە ودیتی ئوکتور و ئەسپەکەی ئاناتای لە نشێوەکەدا هەلّدێراوەو ئاسەوارێکی پان و لوسی لەسەر بەفرەکەدا بەجێهێشتوە وئاناتایش پەریوەتە ئەولاوە. مندالّەکان بەرەو ئاناتای، کە لەسەرخۆ و بەزەحمەت لەسەر بەفرەکە قیت دەبۆوە، رایان کرد. سولّتان مراد زۆر ترساو هەر کە گەیشتە ئاناتای و دیتی

دەستی خوێنی لێدێ دیسان زیاتر ترسی لێنیشت. بۆ چرکەییێك چاوی بەچاوی میرزاگوڵ کەوت. میرزاگوڵ رەنگی پەڕی بوو و سەری لێ شێوا بوو لەگەڵ ئەوشدا کە شۆخ و شەنگترین کچێکی نێو دەستەی کیژان بوو...

هەرکە ئاناتای بەخۆ هاتەوە بەرەو ئەسپەکە لە ناو پشتیە بەفرەکەدا لەپەلەقاژەدا بوو رای کرد. جڵەوەکەی لەچوارپەلی ئالاَبوو. لەم کاتەدا ئەوانی دیکەش لە دواوە بەسەر ڕاگەیشتن. هەموو پیکەوە یارمەتیان داو ئەسپەکە راست بۆوە سەر چوارپەلی. ئەو وەختەبوو، کە سوڵتان مراد گوێی لەدەنگێك بوو و زانی، کە بەخێر گەڕاوە.

هەوڵ و کۆشانی پاڵەوانەکان بۆ خۆ دەرخستن لە پێش میرزاگوڵ بکیچ دا بەو شەرمەزاریە گەیشت. شەرمی دەکرد تەماشای ناو چاوەکانی بکا. بەبێدەنگیەوە پەلەی رۆیشتنیان کرد. وەختی گەڕانەوە بۆ تەویلە بوو. وەختی نزیکبوونەوە یان لە(ئائیل) ئەرگیش پێی زانی، کە ئوکتورو دەڵەنگی. ئەو ئوکتوورەی، کە ئاناتای سواری دەبوو. ئەرگشی دادو بێدای کرد:

- راوەستە، مەگەر نابینی کە ئەسپەکە دەڵەنگێ؟

ئاناتای بە سەراسیمەییەوە پرسی:

- دەلەنگی؟

- بەڵی، سەیریکە بەلاَم چۆن لەنگینەك؟

سوڵتان مراد گوتی:

- بڕۆپێش بڕۆ بتبینم.

لەڕاستیشدا ئوکتور لەلای دەستە راستیدا خراپ دەلەنگی.

دەستیان بە پێی داهێناو بەدەرکەوت کەمەچەکی ئەستوور بووە. کارێکی خراپ بوو. نەیاندەزانی چی بکەن. ئەسپەیان بۆ جووت و کێلان ئامادە و کۆك کردوە. ئەوەیش ئەنجامیبێ. ئەرێ کەس لەسەرەو هەورازی بەفرا پێشبرکێی کردوە؟ ئەو شوێنە شوێنێکە، کە لەهەر هەنگاوێکیدا رەنگە ئەسپ سەرەنگرێ بێ و بگلێ. ئا ئەوهاش هاتە پێشەوە، ئێستا هەرباش بوو خۆیان بەسەلامەتی دەرچون.

- ئاناتای سوورهەڵگەرابوو وبەتورەییەوە ووتی:

- گوناحی تۆیە. تۆ بەزمی پێشبرکێت ناوە.

- ئەدی ئەمن هاوارم نەکرد( راوەستە، بۆکوێ مل دەنێی؟ )

- جاخۆ چ پێویستی بەوە دەکرد پێشم بگریەوە!

- بۆچی تۆ تاوت دا؟

دەمە قاڵەو نانەوەی بێنەوبەرەیان هێندەی نەمابوو بگاتە کوتەك کاری. بەڵام بڕیانەوە و وازیان لە راهێنانەوەی ئەسپەکان هێناو بە ئەسپی شەلەوە بەرەو تەویلە گەڕانەوە. هەمویان گرژو مۆن وبێدنگ بوون وبەبێ دەنگەدەنگ ئەسپەکانیان بردەوە شوێنەکانی خۆیان و ئوکتوروی شلەشیان لەسەر ئاخوری خۆی بەستەوە. ئیدی چی بکەن؟ خۆشیان نەیان دەزانی. بەسەر لێشێواوی چوبوونەوە قەپێلکی خۆیان دەیانزانی، کە دەبێ وەڵامی ئەم کارەیان بدەنەوە. منداڵەکان بە ئاناتایان دەگوت. بڕۆ خەبەری مەیتەر بدە، کەچی رووی داوە و چی بووە. پێی بڵێ ئوکتورو دەشەلێ دەبێ چی بکەین؟

بەڵام ئاناتای ئامادە نەبوو ئەم کارە بکا؟

بۆ چی دەبێ من بچم؟ من، کە گوناهبار نیم. ئێمە فەرماندەمان هەیە. باخۆی بچێ و خەبەر بدا.

دیسان لێیان بۆوە شەڕە کوتەك. قسەکەی ئاناتای، کە دەیگوت:(من گوناحم نییە)خۆی بە گوناحبار نەدەژمارد زێترلە هەموان سوڵتان مرادی لە دین دەبردەدەر. سوڵتان مراد پێی گوت:

- تۆ ژنی، تۆ تەنیا بە قسە ئازای. کەشتێك روودەدا خۆت دەشاریییەوە. تۆ واخەیاڵ دەکەیەوە من دەترسم. ئێستا کەوا دەڵیی باوابێ، خۆم دەچم و باسی هەموو شتێك دەکەم.

ئاناتای نەیبڕیەوە:

- باشە دەبڕۆ. ئەی بۆچی فەرماندەی؟

سوڵتان مراد ناچار بوو خۆی ئامادە بکاو هەموو شتێك وەك ئەوەی، کە رووی دابوو بۆ مەیتەر بگێڕێتەوە. مەیتەر نیگەران بوو و بەپەلە رای کرد و هات، کە ئەسپەگلاوەکە تیمارو چارەسەر بکا. قرەقرپێکی زۆر پەیدابوو. مەگەر گاڵتەبوو؟ رێك لەسەروبەندانی جووتکاری و کێڵاندا ئەسپی جووتیان لەدەست داوە. لەم کاتەدا سەروسەکوتی چکیشی(سەردەستە)پەیدابوو. مەیتەر لەپشکنینی پێی ئۆکتور و بوو وهەوڵیدەدا، کە بەتەواوی بزانێ هۆی ئەستور بوونەکەی چیە، لەبار یەکچونی ماسولکەیە یان ئیسقانی لە جێ چووە. لەهەمان کاتدا دەنگی پێی کەسێك لەدواوە دەهات، هەموویان پێکەوە ئاوڕیان داوە. چکیش سەردەستەکەیان بەسەر ئەسپەوە بوو. ئەو بێدەنگ، گرژ بەترسەوە بەپەلە بۆلای ئەوان هات.

- چی بووە؟

- نازانم ماسولکەی لەجێ چووە، یان ئیسقانی دەرچوە؟
چکیش لە تووڕەییان سوور ببۆوە ونەڕاندی:
- پێویست بە بیرکردنەوە ناکا! هەموتان رادەکێشمە دادگای سەحرایی و هەر لەوێ گوللەبارانتان دەکەم. چکیش قامچیەکەی بەرز کردەوە و وژمی بۆ کوڕیژگەکان برد. مندالّەکان هەریەکەی بۆ لایەك تێیان تەقاند. چکیشیش سەری لەدونان. بەلاّم کەس نەکەوتە بەردەستان. پیرەمێردە زێتر لەبەر تەنگەنەفەسی شین و مۆر هەلّگەراو هەروەك پێشوو، کە تووڕە دەبوو بەدەم هاوارو گەف وهەرەشە وگورەشەو نائومێدیەوە گوتی:
- چاوچاو، سەیری ئەمانە بکە، ئەسپی جووت وکێلّمان بەکێ سپاردوە ئەوانە پیاوخراپن! فاشیستن! پیاو دەبێ هەموویان گوللەباران بکا! چەندەکاروزحمەت و، چەندەیان ئالکیك وپەلخور بەربادا. ئێستا بەچی زەوی بکێلّین؟ ئەو کەبەدادو فەریادەوە هەموو حەوشەکەی وەرگێرابووەسەرسەری خۆی لوتی بەلوتی سولّتان مرادەوە هەلّتۆقی. کاتێك مندالّەکان چوونەدەرێ، سولّتان مراد لەجێی خۆی داماو. و ڕەنگ پەریوو بەترسەوە وەستابوو و لە سەردەستەکە رامابوو. ئەو نەیوێرا لەمەسەلەکە رابکا. —ئەمەتۆی! بەلّێ! ئێستا چاویشم لەچاوان دەبڕی؟ ! چیکیشی پیرمێرد نەیتوانی خۆی بگرێ و قامچیەکەی لە ناوشانی فەرماندەی دەستەی زەبر دا. بەلاّم جاری دووەم هەر کەویستی دووبارە دەستی راستکاوە، وازی هێنا. دەنگی نووساو بە هەرەشەوە پێیەکانی بە ئەرزی دادەکوتاو پێکۆلّیدەکرد:
- هەی سەگباب، لاچۆ لەبەر چاوم ونبە تا وجرووجرم نەکردوی! سولّتان مراد کە تەکانێکی داو خۆی لەخۆیدا دەستەکانی بەبەر دەم چاویەوە گرت، هەر بەوشێوەیە راوەستابوو نیگای بەترسەوەی خۆی لە سەردەستە وەرنەدەگێرا. ئەو چاوەڕێ بوو کە قامچیەکە وەك داغی ئاگر بەناو شانیدا بکەوێ و هەموو توانایەکی دابەرخۆی کە ڕانەکا و خۆی رابگرێ.
چکیش، کە لە سەر سەختی کوڕیژگە، کە سەری سوورمابوو لەپڕ گوتی:
- زۆر باشە با ئەوی ماوەتەوە بۆ ئەوکاتە هەلّگرین، کە باوکت لە جەنگ دەگەڕێتەوە. لە بەردەمی ئەویشدا بە خزمەتت دەگەم. سولّتان مراد بێدەنگ بوو. بەلاّم چکیش دیسانەوە نەیدەتوانی ئارام بگرێ. هەر دەهات و دەچوو و پێی بەزەمیندا دەکوتا و دەستەکانی رادەوەشاند:
- پێت دەلّێم بڕۆ، رادەوەستی! هەر خۆت بیر بکەوە، لەکوێ دەمتوانی بەدوات کەوم! بۆ کوێ بەدوای ئێوەدا رامکردبا، بەلانی کەم ئەگەر بۆ ڕێزلێنانیش با دەبوو رابکەی، ئەوکاتەش

من کەمێك ئۆقرەم دەگرت لـەکێم دەدا؟ لـەتۆ؟ بـەم لـەش و لارەلاواز و جلوبەرگەتـەوە. زۆر باشە، پیرەمێردە ببوورە. هەرکە باوکت گەڕاوە من و پیرەمێـردە پارچەپارچـە بکـە. بـاوابێ. ئێستا بلێ بزانم ئێوە لێرەدا چیتان کردوە.

ئەوێ رۆژێ، کە ئەوشتە روویدا. شانەکە لەسەری سـولتان مـراد داشـکا، هـەقیش بـوو. چکیشی پیرەمێرد لەناو ئەو تێمان وگیرۆدەییەدا چۆن دەیتوانی جلـەوی خـۆی بگـرێ. چـەندە کارو زەحمەت، چەندە هەوڵ و تەقەلا بەرباچوبوو. ئەسپی شلە لـەکوێ و بەکـەلکی چـیدەهات جگە لەسەر بڕین. بەلام کێ دڵی دێ دەستی بەڕوی ئەسپی کاردا بلند بکا.

تەنیا ئومێدیان ئەوەبوو، کە چکیش و خەڵکی شارەزای دیکە دەیانگوت، کە شـتەکە زۆر ترسناك نییە. ئوکتوریان بردە لای پیرەمێردێك ئـەو شـارەزای چارەسـەرکردنی ئەسـپان بـوو. وێنجەو جۆیان بۆ هێناو رۆژانە ئێشکچیان لەسەر دانا. لەخۆشـبەختی دوای چـوارپێنج رۆژان حاڵی بەرەو باشبوونەوە چوو و هێنایانەوە نـاو تەویلەکـە. بەشـێوەییێکی گشـتی ئـەم هەفتـە هەفتەییێکی سەخت بوو. دایکی بێتاقەت بوو. سەرەتا حاڵ و بـاری بـاش نـەبوو و لەدواییـدا تایەکی گەرمی هاتێ و کەوتە ناو جێگا. سولتان مراد ناچار بوو لەماڵەوە بمێنێتـەوە وچـاوی لەدایکی و خوشك و براکانی بێ. تەنیا ئەو کاتە کەباری ماڵەوەیان چەند هەژارو نەدار و تێك چوە. هەرکە بابی چوە سەربازی دەسەر مەڕیان هەبوو. ئێستا تەنیا یەك دانەشـیان نـەمابوو: دووسەریان بۆ گۆشتخۆری خۆیان سەر بڕی و ئەوی ماوەش بەقەرز دایانـە دەولـەت وخـەرجی جەنگ و هەندێکیشیان فرۆشت. باش بوو مانگایان هەبوو، شـیری دەداو بـەخێرایی دەبووایـە بژێ و جاشکەکەی حاجی مرادیش، یاڵ رەش لەدەرەوەی ماڵەوە پیاسەی دەکرد. ولاغـەکانیان هەر ئەوەندە بوو. لاسکە وشکەوبووەکانی گەنمەشامی مـابۆوە. تـازە ئەگـەر زسـتان درێـژەی پێنەدا. کێ دەزانی چیدەبێ. جاشولکەکە دەبووایە خۆی ئالیکی خۆی پەیدابکا. لەدەوروبەری ماڵەوە دڕك ودارو پنجکی دەخوارد. لەلایـەنی سـوتەمەنییەوە بارەکـە خـراپتر بـوو؟ تەپاڵـە دەهات تەواوبێ. دارو چیلکەش هەر بۆ چەند رۆژێـك بەشـی دەکـرد، ئـەدی دوایـی؟ هـەتا گەماڵەکەشیان، ئۆکتوش لاوازو مردۆخ ببوو.

سولتان مراد خەمبار بوو و شەرمی لە خۆی دەکردەوە. رۆژوشەوان لە حەوشەی تەویلـەدا بە تەدارەکی دەستەی زەبروەشێنی ئەکسای سەرگەرم بوو و ئاگای لێنەبوو کـەباری ماڵـەوەیان چەند تێکچوە؟ مەگەر کاتێ باوکی لێرەبـوو حاڵیـان ئـەم بـارە بـوو؟ پـووش و پەلاشـی بـۆ سەرانسەری زستانێ دەدوریەوە و هەتا دەرە بەهاریش بەشی دەکردن. سووتەمەنی و ئاوردووی

زیادەشی دادەنا. ئەمە کەشتێك نییە. زەمانی باوکی سەراپای ژیانیان لەبارێکی دیکە دابوو. هەمووشتێك دڵنیای نەخش بوو، مەعقول وجوان بوو. نەتەنیا بـاری ماڵـەوە بەڵکـە هـەموو جێگاییێك، رەنگە هەر لەسەر تانسـەری دنیـادا بارەکـە بـاش بـوو. حەوشـەی ئـەوان ئێسـتا شێوەیەکی دیکـەی بـەخۆوەگرتبوو. شـتێکی کـەم هـەبوو وەك درەختـی پـایزان، کـە پـەلك وگەڵاکانی رژابن. ئائیل لە جێگای خۆیدابوو، شەقام و ماڵەکانیش وەك خـۆی بـوون و بـەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بەوشێوە نییە، کە لەسەردەمی باوکیدا هەبوو. هەتا چەرخی عارەبانەکانیش، کە لەسەر جادە دەڕۆن ئەو دەنگ و تەقە تەقی خۆشی سەردەمی باوکی نییە، باوکیشـی هـەر بە هەمان عارەبانەی ئێستا دەهات و دەچوو... .

کەسانێکی، کە لە جەمبول بوون دەگێڕنەوە، کە لەشـاردا چ گرانـی و برسـیەتیەك حـوکم فەرمایە و مرۆڤ خواخوایەتی بگەرێتەوە ئائیل. شاریش ئەو شارەنییە، کە کاتی سـەفەرەکەی لەگەڵ باوکی دیتبووی. بۆ ئەوهایە؟ رەنگە لەبەر نەبوونی باوکم بێ. ئێستا ئەو لەکوێیە، لـە چ بارێکدایە؟ بەر لەمانگ و نیوێك دوانامەی ئەوگەیشت. دڵی دایکـی دەداوە کەنامـەکانی دوادەکەون. بەڵام خۆیشی ئاهی هەڵدەکێشا. بەراستیش نامە دەکرێ درەنگ بگا بەتاییەتی، کە لەبەرەکانی جەنگەوە دێن. رەنگە کەس لەوێ دەرفەتی سەرخواردن و نامەنووسینی نەبێ؟ بەڵام مەسەلەکە لەوەیە کە دواکەوتنی نامە لەکانالّی (جو) بۆ دواکەوتنی لەبـەرەی شـەرەوە جیاوازیان هەیە. هەموو ئەمە دەزانن: چ دایکە چ ئەوانیدیکەش هەمویان.

پێرێ شەو، سەحەران، سەگەکەیان هێندە حەپی خەریك بوو هیلاك دەبوو. دوایی بێـدەنگ بوو نوسکە نووسکی خۆشی لێبەرزبۆوە و تەقەی سەرە ئەنگوستێك، کە بە پەنجەرەی دادەکوتی دەهاتە گوێ. دایکی ڕاپەری و لە نوێن هاتەدەر هەرچەندە، کە نەخۆش بـوو ولـە نـاو نوێنـدا کەوتبوو. ئەو و سوڵتان مراد خۆیان گەیاندە بەر پەنجەرەکـە. کەسـێیك لـەودیودا وەسـتابوو. دایکی زوتر کەسەکەی ناسیەوە و بەکوڕەکەی گوت:

– خالۆتانە نورگزی هاتوە. برۆ پێشوازیی لێ بکە. خۆیشی لەحالێکدا لە سەرما چۆقەی درانەکانی[٢٥] دەهات چۆوە ناو جێگاکەوە. نـورگزی، خـاڵی سـوڵتان مـراد لـە کوێسـتان و ناوچیاکاندا دەژیا وسەرانسەری ژیانی لە سۆخۆزەکەی تەنیشتیان بەشـوانییەوە خـەریك بـوو. ئەویشیان بۆ سەربازی برد. هەرچەندە ئەو گەنج نییە بەڵام لە جەمبول ئەو و چەند شـوانێکی

(٢٥) دران: ددان

دیکەیان ناردەوە ماڵەکانیان. کەس نەبوو ئاگای لە ڕانە مەڕەکان بێ نەدەکرا ڕانەکان هەروا بە تەمای خودا بەرەلاّبکرێن. باش بوو، کە خاڵە نورگزی بوو و وەخت ناوەختێ سەرێکی لێدەدان. ئەم جارەیان کەبیستی خوشکی نەخۆشکەوتوە، شەو، کە مێگەل لە ئاخوران دەکرێنەوە، لە کێوەوە بەرەو خوار شۆڕی کردەوە. ئەو هێندە نەدەماوە، ئە مجارەیان تەنیا بۆ ئەوە هاتبوو، کەبزانێ دەنگ و باسیان چیەو زوش بگەڕێتەوە.

ئەو بەدەم وچاوێکی سوورهەلگەراوهەلژەپەتاوەوە، لەحالێکدا پەڵە بەفر بەسەرجلەکانییەوە بەستبووی و ئەو بەخۆی و کەوڵە سەنگینەکەی بەری وکلاّوی گوێداری گەورەی پێستەریۆی و چەکمەی نیو جزمە وبەڵەك پێچی لبادی و بوزەوانەوە، کە تاسەر چۆکانی داپۆشی بوو و، هەیکەلە زەبەلاحەکەی کەبۆنی سەرماو مەڕومالاّتی لێوە دەهات، خۆی بەژورداکردو دەسبەجێ ماڵەکەی تەنگ کردەوە. کەوڵەکەی داکەندو لەنزیك تەخت و نوێنی خوشکی دانیشت و دەستە گەرم و داغەکەی لەناو دەستە قورسەکانی خۆی ناو بەبێدەنگی دەستی کرد بە گوێگرتن لە ترپەترپی دڵی. ماوەیەکی درێژ بە وردی، هەر بەو حاڵەوە، کە مەچەکی ناسك ولاوازی ئەوی بەئەنگوستە قاوەییە پتەوەکانی خۆی، ، کە بەسەختی دەچەمانەوە، گرتبوو. شتێکی دەزانی و شتێکیشی دەست دەکەوت. کەمێك لەفکر ڕاچوو کۆخەیەکی کردو دەستی بەریشی داهێناو بە زەردەخەنەیێکی هیوا بەخشانەوە بە سوڵتان مرادی گوت: شتێکی هێندە نییە، خراپ سەرمای بووە، زۆری سەرما چۆتە ناو لەشەوە. بەنیازی دیتنتان هاتم و. گۆشت و دوگم لەگەڵ خۆمدا هێنا... . دوایی بەمجۆرە تەگبیری بۆ خوشکی کرد:- گۆشتاوی چەورو گەرم وبە بیبەری تیژو پیازەوە بخۆ تا باش ئارەقە بکەی سوڵتان مراد خورجینەکە لە زینەکە داگرە و بیهێنە. هەر چییەکی تێدایە دەری بێنە و بیهێنە ماڵەوە و خورجینەکە بەتاڵ کە. من زۆر نامێنمەوە نابێ مێگەلەکە لەچاوەڕوانیدا تەنیا بەجێبهێلم.

تا دایکی وخالۆی لەحاڵ و باری ژیانەوە کەمێ قسەبکەن ئەو ئاگرێکی کردەوە و سفرەو چای ئامادەکرد. لەم سەروبەندانەشدا منداڵان لەخەوهەڵسان و بەجارێك هەمویان لەناو نوێنەوە بەرەولای خالۆیان ورژمیان هێنا. ئەو ئەوانی لەتەنیشت خۆی بە کەوڵەکە دادەپۆشی. بەڵام ئەوان بەسەر سەروشان وگەردەنیدا دەهاتن ودەخزین. بەتایبەتی حاجی مراد کەخالۆی زۆری خۆش دەویست. لەگەڵ ئەوەشدا پۆلی سێ بوو هەر وەك منداڵۆکان وەك گوێرەکە داوای نەوازشی لەخالۆی دەکرد و خۆی منداڵ کردبۆوە. کلاّوە کەوڵە رێویەکەی خالۆی لەسەر نابوو و

قامچیەکەشی بەدەستەوە گرتبوو چو بووە سەر شانی خالۆی، وەك ئەوەی سواری ئەسپ بووبێ. سوڵتان مراد چەند جارێك رایکێشا خوارەوەو گوتی:

- شەرم ناکەی، وەرە خوارەوە،

بەڵام خالۆ نورگزی رێگای دایە:

- لێیگەرێ، هەقت بەسەردا نەبێ با چیدەکابیکا.

بەیانییەکی پڕ لەشادی وقەڵەبالغی بوو. کاتی رۆیشتنی حاجی مراد بو قوتابخانە هاتبوو بەڵام ئەو ئامادە نەدەبوو. دایکی ناچاربوو بەسەریدا هاوار بکا. بەڵام ئەو دیسان پەلەی نەدەکرد. هەر بەدەورو رۆخی خالۆیدا دەهات. خالۆش خوارزایەکەی ناچار دەکرد پەلە بکا. بەتوندی داوای لێکرد، کە جلەکانی بگۆڕێ. کار بەوەگەیشت، کە سوڵتان مراد خۆی دەستی براکەی بگرێ وتادیوی دەرەوەی ببا.

ئەو هەوڵیدەدا بگەرێتەوە. هەرکە دیتی لەدیوی حەوشەدا ماوەتەوە بەدەنگێکی بەرز لەکورژنی گریانیدا وبەدەم گریانەوەش رێگای قوتابخانەی گرتەبەر. خالّی دڵی پێی سوتاو تووڕە بوو بە سەرزەنشتەوە تەماشای سوڵتان مرادی کرد و گوتی:

- تۆ ئازارت دا؟

- ناخاڵە، من هەر دەستیشم لێنەدا.

- ئەدی بۆچی ئەوها لەکورژنی گریانیدا.

دایکی کەسەری لەسەر سەرینەکە بەرزدەکردەوە بۆ پیشتوانی لە سوڵتان مراد گوتی:

- نورغزی ئەو شتێکی نەکردوە، حاجی مراد لە دڵتەنگی خۆی بۆ باوکی دەگریە. لەبەر ئەو دڵتەنگیەیانە، کە منداڵەکان بە تۆوە دەنووسێن. بێچارە بووین، هەمومان هەر دەردی چاوەڕوانی دەکێشین. هەر هیچ خەبەرێکمان لێ ی نییە. ماوەی دوومانگ دەبێ دەنگ و باسی نازانین. خاڵە نورگزی دەستی بەدڵدانەوەی خوشکەکەی کرد و داوای لێکرد نەگریەو لەبەر منداڵەکان ئاگای لە تەندروستی خۆی بێ و زۆرشتی لەمبارەوە گێڕاوە کەچەندەی بلێ ی بیریان دەکردەوە کەکەسێك مردبێ مردبێ بەڵام دوای شەش مانگان نامەی ئەو کەسە گەیشتووەو وادەرنەچوە. جەنگ. جەنگە. ئەمجارەیان سوڵتان مراد لەپێش دایکە نەخۆشەکەی تێکچونی باری ژیانیانی بەبێ ی باوکی زۆر بە باشی هەست پێکرد و ئەگەر وەك حاجی مراد بچوکتر بووایە لەخەمان لە کورژنی گریانی دەدا و بۆ شوێنێکی دوور هەڵدەهات. حەزیدەکرد، کە هەرنەبێ هیواییێکی بچوکی هەبێ ولەدڵی خۆیدا دەیگوت، با بە با ئێستا ودەم ودەست

نەیەتەوە بەلاّم هەرنەبێ بەلایەنی کەمەوە بزانێ، کە باوکی ماوە و ئەوساکە دەکرا هەناسەییێکی رحەت هەلّکێشێ و چاوەڕێ دەکا وخۆی رادەگرێ. ئێستا ئەو باری خانمی مامۆستاکەی ئینکەمال ئاپای بەباشی هەست پێدەکرد.

جارێك ئینکەمال ئاپای هاتە حەوشەی ئاخوڕ و بۆئەوەی بچێتە مەرکەزی ناحیەکەیان چاوەڕێ بوو تا عارەبانەکە لەئەسپەکە ببەستن. ئەو هەر بە هەمان کۆلّوانە درشت چنراوەکەی و قیافەتێکی پیربووەوە خەمێکی، کە لەچاوەکانیدا مەیی بوو لەنزیك دەرگا گەورە قوپاوەکەی ئاخورێ وەستابوو. دوای رۆژێك، کە گەڕاوە نەتدەناسیەوە. رێك وەك خانمە مامۆستا پیرەکەیان گۆڕی بێ وابوو. چاکترە بلّێین وەك جارانی لێهاتبۆوە. تا چین ولۆچەکانی دەموچاوی ساف و هەلّس وکەوتی میهرەبان و پر نەوازش و لێپرسینەوەی لەکاروباری قوتابیانی ببوو. سولّتان مراد بردیە حەوشەکەوە و ئەسپە ریزکراو و دەستە دەستە کراوەکانی نیشانداو گوتی:

- ئینکەمال ئاپای ئەمانە دەستە چوار ئەسپیەکانی ئێمەن. ئەوان هەموویان بەدرێژایی ئاخورەکە وەستاون.

- ئینکەمال ئاپای نەختێکی پێداهەلّگوت:

- ئەسپی باشن. یەکسەر هەر بەچاو دەزانرێ، کە ئەوان خزمەت دەکرێن.

سولّتان مراد ووتی:

- ئێوە نەتاندیتبوو کە لەچ بارێکدا بوون. زۆر لاواز و مردۆخ و بریندار بوون. لاملی هەموویان بریندار و روشاو بوو، پێیەکانیان زەبریان پێگەیشتبوو. ئێستا ئێمە خۆشمان نایانناسینەوە. ئینکەمال ئاپای ئەمەش چاپداری منە. دەبینی چۆنە. ئەسپی باوکمە. ئەمە ئاکباکایەو ئەوەش جەلتامانە...

لەدواییدا سولّتان مراد کەل و پەلەکانی دیکەی نیشاندا، کە بۆ کارکردن ئامادەبوون. لەدواییدا چون سەیری گاسنەکانیانکرد. هەمووشتێك حازروبزر بوو ودەکرا هەر ئەو کاتە بۆ جووتکردن بەکار بهێنرێن. ئینکەمال ئاپای زۆر رازی بوو و کاتی دوعاخوازی دانی پێداهێنا، ئەوکاتەی، کە لەپۆلیان دەرهێنا نیگەران بوو و لە دلّەوە لەگەلّیان نەبوو و رای لەم کارە نەبوو. ئێستا وا بەچاوی خۆی دەبینێ، کە ئەو خۆ بەقوربانکردنە بێهودە نەبووە. ئەو گوتی، ئێستا گرنگ ئەمەیە، کە سەر کەون و خەلّکیش زووتر لە جەنگ بگەرێنەوە. پاشدان ئەوەی لەدەستمان چوە تۆلّەی دەکەینەوە، گومانی تێدانییە، کە تۆلّەی دەکەینەوە... .

بەدەرکەوت، کە خانمی مامۆستا ئینکەمال ئاپای چۆتەلای فالگرێکی بەناوبانگ، کە هەر جارەی فالەکە بەخێربگەڕێ شتێك لەکەسەکە وەرناگری. چونکە ئەو خۆشی خەڵکی دیکە بە خۆشی خۆی دەزانێ ئەوەندە خۆشحاڵ دەبێ و بەهیچ جۆرێك نەکراوە و ناکرێ شتی درۆیان پێبڵێ. هەمان فالگرەوە سێ جاران فاڵی گرتۆتەوە، کە کوری ئینکەمال ئاپای زیندووەو نە دیل، نەبرینداریش بووە و تەنیا لە بەر ئەو کاروفرمانەی، کە هەیەتی رێگای پێنادەن نامە بنووسێ. هەرکاتێك مۆڵەتی بدەنێ ئینکەمال دەبینێ کەنامەکانی چۆن یەك لەدوای یەك فڕکە دەکەن و دەگەن. راستی و درۆی ئەم قسانە هەمووی بەگەردەنی ئەو عارەبانە چیەیە کەئینکەمال ئاپای و ئەوانیدیکەی بۆ مەرکەزی ناحیەی بردبوو. ئەو وەختە سوڵتان مراد لەم بارەوە سەری سووڕما، کە هەتا ئینکەمال ئاپاییش سەردانی فالچی کردوە. بەڵام ئێستا دەرك بەترس ونارحەتیەکانی دەکاو، هەتا بڕیاریشی دا، کە کاتێ دایکی تەندروستی باشتر بوو، بچێتە لای ئەم فالچیە تا دەنگ و باسێکی باوکی لێوەرگرێ. بەڵێ، بیرکردنەوە لەبارەی ئەوشتانە بێتام ترسناك بوو. بەڵام بیرکردنەوەی خۆشیشیان تێدابوو، کە دەتگوت خۆیان لە خۆیاندا پەیدا دەبوون. وەك هەڵقولانی ئاوێك، کە بێ سەروسەدا بۆ سەرچاوی کانی بەجۆش هەڵدەقولان. ئەم بیرکردنەوانە ئەوانە بوون، کە پەیوەندیان بە میرزاگوڵەوە دەبوو.

سوڵتان مراد لە راستی دا هەوڵی نەدەدا، کە ئەم شتانە بەبیرخۆی بێنێتەوە، ئەوان خۆیان وەك چۆن گیاوگوڵ لەخاك سەردەردێنن ئەوها سەریان دەردەهێنا. خۆشی ورۆناییەکە لەوانەوە بوو. لەبەر ئەمە حەزینەدەکرد وازیان لێبێنێ، دەیویست هەمودەم هەر بیر لە میرزاگوڵ بکاتەوە و هەر بیر بکاتەوە. هەرکاتێك کەبیری لێ دەکردەوە، دەیویست کارێك بکاو بپرژێتە سەرکارێك و لە هیچ شتێك وکارەساتێك وگیروگرفتێك نەترسێ. بەڵام لە هەموی زیاتر حەزی دەکرد، کە میرزاگوڵ ئاگاداری ئەم بیروخەیاڵاتەی ئەو بێ. سوڵتان مراد هێشتا لەروی عەقڵ وهۆشەوە نەیدەزانی ئەو شتانەی، کە لەمێشك وگیانی ئەودا بەدەردەکەون چی ناودەنرێ. بەڵام بەشێوەیەکی نادیارو لەژێرەوە مەزەندەی دەکرد، کە رەنگە ئەمە عیشق خۆی بێ و، کە لەخەڵکی دیکەوە لەسەر ئەم عەشقەی بیستبوو و لەکتێبانیش خوێندبوویەوە. زۆر جاران پیاوە زاناوداناکانی، کە دەچوونە بەرەکانی جەنگ داوایان لێکردبوو کەنامەکانیان بە کچۆڵە و ژنە جوانەکان بگەیەنێ. و ئەویش ئەم نامە دڵداریانەی بە غروریەوە ئەنجام دەداو هیچ کاتێك ووشەیێکیشی لەمبارەوە بۆ هیچ کەسێك ئاشکرا نەدەکرد. مەگەر پیاو لەبارەی ئەمەوە زۆر وەڕی و زۆر بڵێ ی دەکا؟ جارێکیان یەکێك لە خزمەدورەکانی کەناوی جامانکول بوو تکای

لێکرد، نامەیێکی وای بۆ بنووسیٚ. جامانکول، کە لاوێکی کـەم خوێنـەوار بـوو، هەمیشـە لەناو کێوو چیایاندا لەگەل مێگەلان ئـەم لاو ئـەولای دەکـرد. لەپڕێکـدا دەفتـەری خزمـەتی سەربازی وەرگرت. رەنگە ئەو گەنجە ویستبێتی خواحافیزی لە کچە خۆشەویستەکەی خـۆی بکا و هەرچەندە بە کاغەزیش بیٚ هەست ونەستی خـۆی بـۆ ئـەو دەربڕیٚ(چـونکە لـە ئائیـل پەیوەندی لەگەڵ کچان بەر لە هاوسەریتی وگوێزانـەوەی داب نـەبوو)جامانکول پێـی دەگـوت وسوڵتان مراد دەینووسی. نارەحەتی جامانکول و کاتی هەڵبژاردنی وشە چۆن دڵـی دەکەوتـە تەپە تەپ و خورپە و چـۆن تانامەکـە تـەواو بـوو وگـەروی وشـکهەڵات، ئەمانـە هـەمووی پێکەنیناوی دەهاتنە بەر چاو. سـەرەتا سـوڵتان مـراد ئامـادە نـەبوو تکـاو داخوازیـەکانی بێنێتەدی. بەڵام جامانکو قەڵەمبڕێکی بچووکی دەسك شاخی دایە و رازی کرد.

سوڵتان مراد نەیدەزانی، کە دوای ساڵێك کەمتر خۆیشـی تووشـی ئـەم شـتە دەبـیٚ، کـە ئەوەندەی جامانکولی بێچارەی خستبووە دڵەڕاوکەوە. بەتایبەتی هەر ئەو جامانکولە بوو، کە لەتەنیایی خۆی لەناو کێواندا شیعری دانابوو. ئەو شیعرەی، کە ئێستا سـوڵتان مـراد بـەبیری دێتەوە ولە دڵی خۆیدا هەر دەیگوت ودەیگوتەوە ئەمەبوو:

گەڕام بە هەموو ئەکسای وکوکسای

وەهەروەها بەسەرانسەر ساریسای

گەڕام وهەرتەیمکرد شەو ورۆژ

جوانێکم لەوێنەت نەدیت تۆ پەری ئاسای

بەبیری داهات چـۆنە ئـەویش نامـەیێك بـۆ میرزاگـولٚ بنووسـیٚ و ئـەم مەوزوعـەی کـە توانیویەتی بەبیٚ هەست بەشەرم کردن و ترس بۆ روون کردنەوە و گەیاندنی هەسـتەکانی خـۆی لەدور، وەسیلە و تەرزێکی موناسب وگونجاو ببینێتەوە ومەیلەکانی تێدا بهێنێتە ئارا، کە دەر لەحاز کاری باش بکا تاخەڵکی دیکەش وەك ئەو بەختەوەر بن چێژی خۆشی بچێژن. بەم نیازە ئەو بەر لەهەمووان دەبیٚ یارمەتی دایکی بدا تا زووتر چاك بێتەوە، تاکەمتر لەمەڕ باوکیـەوە نیگەڕان بیٚ، تا دووبارە لەناو کێلگە بپڕژێتە سەرکار، تا ماڵەکەیان گەرم و گوڕو ئارام بـیٚ و سەرەنجام تادایکی کەمیٚ بۆنی ئەوە بکا کەکوڕەکەی دڵی بەکەسێکەوەیە و لەبەر ئەمە هەموو دەوروبەری گۆراوە و بەرەوباشی چوە... .

ماوەی ئەو دووسێ ڕۆژانەی کە سوڵتان مراد لەماڵەوەی بەسەرد برد ئەوەندەی کارکرد کە بەدرێژایی ساڵەکە نەیکردبوو. هەموو کارێکی ماڵەوەی بەسەرکردەوە وهەموو جێگایەکی خاوێن کردەوە و هەڵیێبژارد و زۆرجاران لەدایکی دەپرسی:

- حاڵ و بارت چۆنە؟ ئەگەر شتێکت پێدەوێ بیڵێ؟

دایکیشی هەمووجارێك بەزەردەخەنەییێکی تاڵەوە دەیگوت:

- ئێستاکە تۆ ئەوەندە باش بوویی ئیدی ترسم لەمردن نییە. نارەحەت مەبە، ئەگەر شتێك پێویست بێ دەیڵێم.

سوڵتان مراد، شەو کاتێك کەهەموویان خەو بردبوونییەوە نامەی نووسی. ئەو زۆر نیگەران بوو. لەگەڵ کەهیچ کەسێك و هیچ شتێك نەیدەتوانی نارەحەتی بکا. بەڵام زۆر پەشۆکا بوو. سەرەتا بیری کردەوە چۆن دەستپێبکا. جارێك ئاوهاو جارێکی دیکە بەجۆرێکی دیکەی نووسی و هەرجارەی وایدەزانی وەك چۆن دەبووایە نامەکە بنووسێ ئەوها دەرنەچووە. بیرۆکەکانی بڵاو و دووردەکەوتنەوە وەك چۆن بەردێك بۆ ماستاو خواردنەوە(١) بئەنگاوتیە سەرگۆمێك و بازنەی ڕێکی یەك لە دوای یەك دروستبکا وابوو. حەزیدەکرد، کە هەر بیرێکی لە ناو زەین ومێشکی دا پەیدا دەبن هەمووی هەر بنووسێ. بەڵام وەك دەیویست ئەوها بیخاتە سەر کاغەز وشەکان پێکەوە دروست نەدەهاتن و تێك دەئاڵۆزکان. بەر لە هەمووشتێك دەیویست بۆ میرزاگوڵ بنووسێ، کە چەندە جوانە، لەهەموو ئائیل وبەڵکە لەهەموو دنیاشدا جوانێکی وەك ئەو نییە. بۆی بنووسێ، کە لەکن ئەو لەدنیادا شتێکی خۆشتر نییە، کە لەناو پۆل دابنیشێ و تەماشای ئەو بکا و هەرتەماشای سای گەردەنی بکا و تا زۆر چێژ لەتەماشاکردنی جوانی ئەو وەرگرێ. بەڵام ئێستا بارەکە گۆڕاوە و ئەو و کەسانی دەستە، کە ناچنە قوتابخانەو دیار نییە کەی دەچنەوە قوتابخانەو سەر دەرس و خوێندن. ئێستا ئەو (سوڵتان مراد) میرزاگوڵ زۆر بەکەمی دەبینێ و زۆر زۆر ئازار بە دەست ئەم حاڵەوە دەکێشێ و لەتاو ئەو دڵی هێندەی هێلکەیەکی لێماوەتەوە.

(١)ماستاوخواردنەوە:کەبەرد دەهاوێیە سەرئاوی گۆمێك وچەند جارێك بەردەکە لەناو ئاوەکە بۆ سەرئاوەکە هەڵدەقۆزێتەوە و هەرجارەش کۆمەکێ بازنە بەدوای خۆیدا جێدەهێڵێ.

ئەوەندە مات وخەمبارە، کە جاری واهەیە گریانی دێتێ. سوڵتان مراد نەیدەویست دان بەم شتەدا بنێ. چۆن پیاو دەبێ پیاوبێ. بەڵام کاتێ، کە بەراستی گریان و فرمێسك لەناوەوەی بەرەو گەروی سەریاندەکرد. دەبووایە لەنامەکەدا بۆ میرزاگوڵی روون بکاتەوە، کە بەهیچ

جۆرێك لە خۆراو بەرێکەوت وبەروکار لەزەنگی پشـوودا نزیـك نـەدەبۆوە و ئـەو (میرزاگـولّ) بێهودە لێی رادەکرد. ئەو هیچ شتێکی خراپی لە مێشکدا نەبوو. هەروەها زۆری حەز دەکـرد، کە روداوەکەی ئەسپ تاودانەکە روون بکاتەوە. واتە ئەو روداوەی، کە ئاناتای بێحەیاو شـەرم و چەقاوەسو دەیویست تێیدا نیشان بدا، کە ئەو لە سولّتان مراد و لەناو دەستەکەشدا بوێرترین و بەهێزترینیانە و بەشێوەیەکی گشتی دیارترین کەسی ناو دەستەکەیە. بـەلاّم ئـەم شـتانە، بەهەمان شێوەی، کە ئەو خۆی (میرزاگولّ) یـش دیتـی و گرفتـار بـوو بێکـەلّك بـوو. تـەنیا مەخابنە، کە ئەسپەکەی ئەو (ئاناتای) ئازاری بینی. بەلاّم گرنگترین شـتێکی، کـە سـولّتان مراد دەیویست بۆ میرزاگولّی باس بکا ئەمە بوو، کە چۆن لـەپڕتاو ئـەوی لەسـەر گردەکـەوە لەناو تاقمە دەم پڕ لە هات و هاوارەکەی هاوپۆلیەکانیدا ناسیەوە و چۆن یەکسەر گیرۆدەی بوو و کەدەمێکە زۆری خۆش دەویّ و کاتێك ئەو باوەشی کردبۆوە و بەدەنگی بەرز شتێکی دەگوت و لە گردەکە سەرەونشێو رایدەکرد، چەندە شۆخ وشەنگ بوو. کاتیّ، کە میرزاگولّ رووبـەرووی ئەو رایدەکرد وەك مۆسقا، وەك تافگە وگڕی ئاگربوو...

دووجاران ناچار بوو فتیلەی چـرا نەفتیەکـە هەلّکێشـیّ بـەوە بـاش بـوو کـە دایکـی لـە ژوورەکەی دیکە نووستبوو و نەدەدیت، کە چۆن دواتنۆکەکانی چۆڕە نەوتەکە دەسوتێنیّ. بەلاّم نامەکە هەر وەك ئەو دەیویست نەدەهاتە دەربرین، نەوەك لەبەر ئـەوەی ئـەو شـتێکی نـەبوو دەربیڕیّ و بینووسیّ، بەپێچەوانەوە حەزیدەکرد هەمووشتێك لەنامەکەدا باس بکا. زۆر دەمێك بوو لە ئائیل پەنجەرەکان روناکاییـان تێـدا نـەدەبینرا. هـەروەها زۆر دەمێکـیش بـوو، کـە سەگەکان لە حەپە حەپ کەوتبوون. وە زۆر دەمێك بوو، کە لەژێر بالّی ئـەو شـەوە هێمنـەی مانگی رەشەمێدا لە پێدەشتی دامێنی زنجیرە چیای ماناس دا هەموو لێی نووستبوون. لەودیو پەنجەرە لـەدەرەوە تاریکاییـەکی ئەنگوسـتە چـاو هەمووشـتێکی داپۆشـیبوو وبـالّی بەسـەر هەموولایەکدا کێشابوو. وای هاتە بەرچاو، کە لەهەر هەموو دنیادا تەنیا ئەوان مابوونـەوە. شەو و ئەو لەگەل هەموو خەیالاّتی لەبارەی میرزاگولّەوە. سەرەنجام بریاری خۆیدا. لە دواییـدا بەناوی (نامەی عاشقانە) ئەم نامە بۆ نـازەنین وبـەنرخ، کـە لـە ئائیـل دا دەژیـەو پڕشـنگی جوانییەکەی دەکریّ جێی روناکی چرای مالّەوە بگرێتەوە. نووسراوە. لەدواییدا نووسـی، کـە لەبازاردا هەزار کەس بەرەو روی یەکدی دەبنەوە بەلاّم تەنیا ئەوانەی سلاّو لەیەکـدی دەکـەن حەز دەکەن دەستی یەکدی بگوشن. ئەو هەموو ئەو شتانەی ناو نامەکەی جامـانکولی لـەیاد

بوو. لەدواییدا میرزاگوڵی دڵنیاکرد، کە وای دانـاوە هـەموو ژیـانی خـۆی تـادوا هەناسـەی بەراگێری ئەو بکاو هتد... . لەکۆتاییدا شیعرەکەی جامانکولی نووسی.

گەرام بەهەموو ئەکسای و کوکسای

وەهەروەها بەسەرانسەری ساریسای

گەڕام وهەر تەیم کرد ڕێ شەو ورۆژ

جوانێکم لەوێنەت نەدی تۆ پەری ئاسای

ڕۆژی دوایی دوای ئەوەی حاجی مراد لەقوتابخانە گەراوە. پێکەوە بۆ کۆکردنەوەی نەختێك چیلکەو چاڵ چوونە چۆلی. جاشولکەکەی حاجی مراد (یال رەش) یان کورتان کرد و گوریس و دەستکێشی کار و تەور داسیان لەسەر کورتانەکە بارکردو سەگەکەیشـیان (ئـاکتوش) یشـیان بەدوای خۆیان خست. ئاکتوش بەزەوقەوە بەدوایاندا دەبەزی. حاجی مراد بەپێی مافی خۆی، مافی برابچوکی، سواری ولاغەکە بوو و برایەکەشی ولاغەکەی لێدەخوری. ولاغ لێنـەخوری خێرا ناروا. ڕێیەکی دوریان لەبەربوو. سوڵتان مراد شوێنێکی پێدەزانی، کـە چـیلکەو چـاڵی زۆری لێبوو. ئەو جێگاییێکی دور، لە ئاوەرۆی دۆڵی تویوك جاڕدا بوو. بەهاران و هاوینان لـەو دۆڵەدا لەهەموولایەکەوە ئاوی بەفرو بارانی پێدا دەرۆیشت. لەناو دۆلەکەدا خوڕەی ئاوەکان و ڕێژنەو گفەی باو و شریخەی بروسکان دنیای پڕ دەکرد. بـەڵام پـایزان بنـەپنجکی بـە بـەژنی مرۆڤی لێدەڕوا. خەڵك کەم دەچوونە ئەوێ. بەڵام هەر کەسێ دەچوە ئـەوێ بەدەسـتی خـاڵی نەدەگەڕاوە.

هەرچی پنچك ودڕی و چیلکەو چاڵی ئەو نزیکانە بوو زۆر لەمێژ بـوو تـەواو بـوو. لەبـەر ئەمە دەبوو بۆ تویوك جاڕ بڕۆن. سوڵتان مراد ئەرێی[٢٦] بە دایکـی دابـوو، کـە بـەر لـەوەی بچێتە ئەکسای چیلکە و چاڵ و سوتەمەنی بۆ ماڵ دابین بکا.

ئەو، کە لەسەرەتادا لەناو بیرو خەیالاتی جیاجیادا ناڕەحەت بـوو و بـەڕێگاوە دەرۆشـت و هێندەی وەلامی ئەو هەموو قسە زۆرانەی برایەکەی نەدەداوە. ئەو بابەتانـەی کـە دەبووایـە. بیریان لێ بکاتەوە کەم نەبوون. وەرزی چونی جووتێران بەرەو ئەکسای نزیـك دەبـۆوە. تـەنیا چەند ڕۆژێکی کەمیان لەبەردا مابوو. هەمیشە مرۆڤ پـێش ڕۆیشـتن بـۆی دەردەکـەوێ، کـە چەندە کاری زۆر و زەبەند ماوە و جێبەجێ ی نەکردون. بەتایبەتی و ردەکـار و خـرت وپـرت.

---

(٢٦) ئەرێ: وەعدە.

ئاخر خۆ لە ئەکسای پێویستیت خوانەکا بە بزمارێك بێ دەستت ناکەوێ. باش بوو، کە تینعەلیۆف سەرۆکی کۆلخۆز بۆ تاوێك سەری لە ماڵی ئەوان خوارکردەوە. هات تابزانێ دایکی سولتان مراد چۆنە و کاروباری فەرماندەی دەستە لە چیدایە. ئەو پێی گوت، کە باری نیشتە جێبوونیان لەسەر کێلگە چۆن چۆنی دەبێ. بڕیاریان دا لەوێ چادر و تاوڵ هەڵدەن. پێی گوت کەوا چۆن خواردن و ئالێك بۆ ئەوێ دەبەن و لەویش گرنگتر لەگەل دایکی قسەی کرد. دایکی سولتان مراد لەم دوادواییدا لەتاو نەخۆشی و لەتاو نەگەیشتنی نامەی باوکی سولتان مراد زۆر تووره ببوو. ئەو لەگەل سەرۆکی کۆلخۆز دا دەنگە دەنگی بوو

- پێم نالێی ئەم منالانە بۆ کوێ دەنێری؟ ئەوان لەم چۆلیەدا لەناو دەچن، گوتی من رێگا نادەم کورەکەم بێتە ئەوێ. خۆم نەخۆشم. منداڵەکان بچوکن. هیچ دەنگ و باسێکی مێردەکەم نییە. ئالیك وسوتەمەنیمان لە ماڵەوە نییە. سەرۆکی کۆلخۆز لە وەلامدا گوتی: یەك کەمێك ئالیك و پووشتان دەدەمێ. بەهیچ جۆرێکیش پتر لەمە ناتوانم. زەوی کێلان زۆر نزیك بۆتەوە. ئەو هیچ وەعدێکی سوتەمەنی پێنەدان. تا رەنگیشی لە رودانەما هەروەها لەناوەوەی خۆیدا زۆر تێکچوو و گوتی: لەبارەی ژیانی منداڵەکانمەوە لەو دەشت و ئاقارە دا رام لەگەل رای ئێوەدا نییە و لەگەڵتاندانیم، هەر چەند لەناخی دڵەوە هاودەردیتان دەکەم. ئەمە ئەرکێکی وەك هی بەرەکانی جەنگە. رازی بوون و نەبونتان لەسەر ئەمە بایەخێکی نییە. دەبێ ئەوە جێبەجێ بکرێ و بەبێ چەندو چونیش. ئەگەر پیاوەکانتان بەر لە هێرشهێنان دەستیان بە گریان و زاری دەکرد، کە ئەمەمان نییە و، ئەمەمان هەیە، سووتەمەنی نییە، خواردنمان نییە ئێمە دەمانتوانی چ هەلمەتێك بکەین. ئەوسا چی رویدەدا؟ لەجەنگدا مۆلەتێکی وا بەخەلکی نادەن.

بۆ ئێمە ئەکسای شوێنی هەلمەت بردنمانە. ئێمە بە هەموتوانامان لەگەل منداڵە قوتابیەکاندا، ئەم هەلمەتە دەکەین. کەسی دیکە نییە. قسەییێکی زۆر لەم بابەتەکرا. مرۆڤ، لەلایەکدا دڵی بەدایکەوە دەسووتا و لەلایەکی دیکەدا بە سەرۆکی کۆلخۆز، مرۆڤ دەبێ خۆی لە جێی ئەو دابنێ، ئەم کارانە بۆ رابواردن ناکا. کات زۆر زۆر کەمە. ئەو گوتی هەر لەگەڵ حاڵی دایکت کەمێ باشتربوو یەك دەقەش خۆت دوامەخەو وبرۆ سەرکارەکەت.

دایکی لەدوێنێوە کەمێ باشتر بووە و خرتەخرتێکی لەماڵەوەشدا کرد. ئێستا دەبووایە بە سۆراغی کوریژگەکان وتەویلەکەدا بچێ. بەلام ئەگەر لە ژێر زەویشدابا دەبووایە هەندێ سووتەمەنی پەیدا کردبا. نابێ خێزانەکە بەبێ ئاگر بەجێبهێلێ... .

ڕۆژێك لە ڕۆژانی سەروبەندانی بەهاربوو. هەوایەکی خۆشی نیوەڕۆ بوو. هەوا نەزستانی بوو نەبەهاری. سازان وئارامی نێوان دوکژ بوو. دەوروبەر خاوێن، زۆر بێدەنگ و بەرگوشاد بوو. هەندێ جێگا بەفری سست و دامرکابۆوە. پانتاییێکی زۆری زەوی ڕەش دەچۆوە. لەو دوری دورانەوە پەیکەری گەورەی چیای بەفرگرتوو لەهەواییێکی ساف بە تەرزێکی سەرسوورهێنەر سپی دەچۆوە. چ کارێکی زۆر و زەبەندی لەسەر بکەن!

سوڵتان مراد وەستاو هەوڵیدا زەویەکانی ئەکسای لەوێ لە خۆرئاواوە لە نشێوی دامێنی زنجیرە چیا زەبەلاحەکانی ماناسدا بنۆڕێ. بەڵام لەو دووریەوە، کە بەدەشتی ئەکسای ناو دەبرا هیچ شتێکی نەدیت. هەموی هەر ئاسمان و ڕووناکی بوو... . بڕیار بوو لەو ڕۆژانەدا بەرەو ئەو شوێنە بچن. لەوێدا حال وباریان چۆن دەبێ؟ لەو ناوچەیەدا چی چاوەڕوانی دەکردن؟

تەزوێکی ساردی بە پشت ملی داهات بەڵام کیژەکەی خۆش بوو. حاجی مراد لە خۆشحالیان، لە ڕۆژێکی ئازادو لەمەی برایەکەی لە تەنیشتیەوە بوو و سەگەکەیشیان وەفادارانە لە نزیکیانەوە ڕای دەکرد و لەوەی، کە لە تەواوی ئەو دنیایەدا کەوتبوونەوە ناو حاڵی خۆیانەوە و دەچن تا سووتەمەنی بۆ ماڵەوەیان بهێنن گێژو وڕ ببوو و بەسواری کەرەکەوە بەدەنگێکی ناسك گۆرانی جیای جیای سەردەمی پێش جەنگی دەگوت:

ماریشال و فەرماندەکان

فەرمان دەرکەن

تاهەموومان

یەك دڵ و گیان

دەست بەکار کەین

ئەگەر دوژمن

هەزاران ملیۆنیش بن

هەرهەموویان تا دواکەس

نابوت دەبن

ئای لە دنیا بێ ئاگا! ئای کەم عەقل... . .

بەڵام حاجی مراد کاری بەسەر هیچەوە دانەبوو و نقومی ناو جیهانی خۆی بوو لەسەر گۆرانییەکانی خۆی بەردەوام دەبوو:

(یەك- دوو- یەك- دوو)

(رێکتر هەنگاوت هەڵێنە)

سوڵتان مرادیش سەرحاڵ بۆوە، مرۆڤ بەدیتنی ئەم پاڵەوانەی سواری جا شەکەرەکە لە قاقای پێکەنینی دەدا. ئەوان لەکاتی تێپەڕینیان بە رۆخ جێ خەرمانی ساڵی رابردو لە خۆڕا مات بوون. لەم چۆلاییەدا نێوان باوەشە پووشە نیو رزیوەکانی کلۆشی گەنم(١) کەبۆنی بەهاریان لێدەهات. بێدەنگیەکی بیابانانە بالی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو. ساڵی رابردو هەرکە جەنجەرکاری کۆتایی هات هەمووشتێك لەم ناوەدا کپ بۆوە. بۆنی کای شێدار و رزینی کاو و کۆت و هەروەها بۆنی گیانی خامۆشی هاوین دەهات. چەرخێکی شکاوی بێ ئالقە کەوتبوە رووبارەکەوە و، کۆلیتە پووشینەییەکەی بە دەسکی قەسەڵی گەنم داپۆشرابوو و وەك خۆی مابۆوە. لە گەرمای هاویندا، جەنجەرچی و ئەوانەی لەسەر خەرمان کار دەکەن لەناویدا دەحەسانەوە. لەناوەڕاستی گۆڕایی شوێن خەرمان، دەنکەکانی کاتی شەنەباکردنی گەنم لەوێ مابوونەوە و ئێستا بە جۆرێکی چڕوپڕ لە پاڵ یەکدا شین ببوونەوە.

ئوکتوش بەهەڵەداوان بەم لاوئەولادا دەهات و رایدەکرد لەخەرمانگەیەکدا بۆنی هەندێ شتی دەکرد و کۆترە کێویەکانی دەترساندو هەڵیدەفڕاندن. ئەوان لە ژێر لاسکە قەسەرە بەشەختە بەستوەکان، کە بەسەریەکدا کەڵەکە کرابوون هاتنە دەر ولەشەقەی باڵیاندا. ئەوان بەدرێژایی زستان لە شوێنی پەنا بادا، چینە یان دەکرد. ئەوان بەگمەگم و خۆشیەوە لەسەر کێلگە و بەرەوە بەخێرایی و بەسەر زەمینی رێك و راست دەخولانەوە. ئەقتوش یەك دوو وەرە وەڕی کرد و بەدوایاندا رای کرد

(١) کلۆش: قەسەر

و دوایە ملی رێگای خۆی گرتەوە بەر. حاجی مرادیش هاواری کرد و ترساندنی و بەزویی ئەوانی لەبیر چۆوە. بەڵام سوڵتان مراد ماوەیێکی زۆر تەماشای فرینی ئەوانیکرد و لەفڕینە چوست و چالاکەکانیان و بە دەرکەوتنی سپێتی پەڕەکانیان لەبەر هەتاو دا چێژی دەبینی و کاتێك دیتی چۆن جووتێك لەنێوانیاندا لە رەوەکە جیابونەوە و بەتەنیشت یەکەوە بۆ ئەو دەوروبەرانە فڕین، کەوتەوە یادی مامۆستا لاوەکەی دەرسی بیرکاریان، کە چووە خزمەتی سەربازی.

من کۆترە شینەکەی ئاسمانی شینم
تۆ مەحبوبەکەم
لەپاڵی مندا بە دڵێکی خۆش

بالاّن دەکوتی
خۆشیەك لەجیهان لێی خوشتر نییە
هەتا هەتایە، بێ جیابوونەوە
لە شەققەی باڵ دەی
لە ڕۆخ مەعشوقەی بێقەراری خۆت...

ئەو مامۆستایە، کە لەمەیخانەیەکدا خۆی مەست کردبوو وکاتی بەرێکردنی بەسواری عارەبانە لە ئائیل دەچوە دەر ماوەییێکی دور و درێژ هەر ئەم گۆرانیانەی دەگوت، کە ئەو کۆترە شینەکەیە و لەئاسمانی شیندا دەفرێ و مەعشوقەکەیشی کۆتریکی مێیە، کە بەتەنیشت ئەوەوە دەفڕێ... . ئەوکاتە ئەم گۆرانییە زۆر پێکەنیناوی بەرگوێ ی سوڵتان مراد کەوتبوو، مامۆستاکەشی، کە زۆر لێبڕاو و ترسناك بوو وەك گاڵتە هاتە بەرچاو بەلاّم ئێستا جووت کۆترێکی کێوی دووری بە سەیرکردن بەرێدەکرد لە جێ ی خۆی وشك بوو لەرزی هاتێ و حاڵی تێکچو. ئەم گۆرانییەی مامۆستای ماتماتیك زەبرێکی توندی لێوەشاند و ئەو زانی، کە ئەو کۆترە شینەی لە ئاسمانی شیندا دەفڕێ ئەو خۆیەتی و کۆترە مەحبوبەیێکی لە تەنیشت ئەودا دەفڕێ میرزاگوڵە و لەسەرینایی ئەوە حەزی کرد، کە دەم ودەست لەکەنار ئەودا، کەناری میرزا گوڵ دابێ تا هەر وەکو ئەم دوو کۆترە بفڕن. دوو کۆتری، کە لەسەر زەمینێکی تەختی زستانی کەوتە یادی نامەکەی بۆ ئەوی نووسبوو و بڕیاریدا شیعری گۆرانییەکەی پەیوەند بە کۆترەکانەوە، کە ناوی (کۆتری سپی) بوو لە ناو نامەکەدا بگونجێنێ...

ئێستا هەموو باسەکە لەسەر ئەوەبوو، کە چۆن نامەکەی بداتێ. سوڵتان مراد دەیزانی، کە میرزاگوڵ لەبەر چاوی منداڵەکان قەت نامە لەو وەرناگرێ. لەبەر ئەوە ئەو هەتا لەکاتی زەنگی پشودان لێی رادەکرد. بەتایبەتی ئێستا، کە ناچێتە قوتابخانە. ناکرێ بچێتە ماڵیان، بنەماڵەکەیان توندن. تازە چۆن دەتوانێ بچێ و ئەگەر بچێ چی بلێ، چ بیانوویەك بێنێتەوە؟

ئەم پرسیارە بۆ خەڵکی دێتە پێشەوە کاتێك دوو کەس لەیەك ئائیلێکدا دەژین بۆ دەبێ پەنا بۆ نامە ببەن: هەرچەندە ئەو پتر بیری دەکردەوە حەزی دەکرد میرزاگوڵ ببینێ و لەمبارەوە ئاگاداری هەبێ، کە ئەو چۆن بیری لێ دەکاتەوە. زۆر گرنگ بوو، لە رادە بەدەر گرنگ بوو، لەهەموو شتێك گرنگتر بوو، کە میرزاگوڵ لەم مەسەلە ئاگاداربایە.

لەسەرانسەری رێگا دا جارێك لەبارەی میرزاگوڵ، کاییێك لەمەڕ چونی بۆ ئەکسای و نەیزانی چۆن گەیشتنە دەوروبەری تویوك جارِ. پیاوێکی بە وێژدان و بەرێزی لێبووە. بەلاّم

هێندەشی چیلکە و چاڵ و سوتەمەنی، کە لەکەلێن و کەلەبەری، ئەم بەرو ئەو بەری رووبارەکەدا بەستوویەتی و لەنێو بنچکە پێکەوە نووساوەکانەدا هەیە زۆر لەوەش زێتر بوو، کە پێویستیان بوو. گرفتەکە پەیداکردنی سوتەمەنی نییە بەڵکە گرفتەکە ئەمە بوو کە چۆنی بارکەن و هەڵکرن. بەبێ ئەوەی زۆر بیری لێبکاتەوە دەستیان بەکار کرد.

(یاڵ رەش) یان بەرەلا کرد تابلەوەرێ و پووش وپەلاشێکی، کە لەژێر بەفردا بە دەرەوە بوون بخوا. ئەکتوش پێویستی بە ئاگالێبون نەبوو. ئەو لەو ناوەدا بۆ هەرلاییێکدا رای دەکرد و نەدەزانرا چی بۆندەکرد. دوو برا خێراو سەرکەوتوانە کاریان دەکرد. بەداسەکانیان پنچکە وشکەکانیان دەدوریەوە و لاسکە براوەکانیان گردەکردەوە تا لەدواییدا بەگوریس بیانپێچنەوە. ئەوان بەبێ دەنگی کاریان دەکرد. خێرا گەرم داهاتن. چاکەتەکانیان داکەند و لەجێگایەکیان دانان. برینی پنچك و پووش وپەلاش دورینەوە بە داس کاتێك باشە، کە قەدەکان پتەو ئەستوربن. لە دەوروبەری ئائیل ئەم جۆرە پنچك و پەلاشە نەدەدیترا. لەکوێ ئەوە لەوێ پەیدا دەبێ. لێرە مرۆڤ کەیف دەکا. دەکرا لە بن و بێخەوە و دەسك دەسك ببڕدرێن. مەحچەچە[27] دەنگێکی پر لەخشە خشی وشکی لێوە دێ و دەنکە وشکەکانی ناو مەحچەچەکان دەنگێکی لێوە دەبیسترێ. ئەم دەنکانە بە کۆمەل بەسەر بەفردا دەرژێن و دەنکەکان بۆنێکی تاڵ و توندیان دەدا وەك ئەوەی هاوین بێ و مانگی گەلاوێژ دایك و خوشکە بچووکەکانی بەدڵیان دەبێ. کاتێك زۆپا لەماڵەوە باش دەسووتێ ورەی مرۆڤیش بەرز دەبێتەوە... .

برایەکان زۆریان کار کرد و دەیانویست پشوویێکی کورت بدەن، کە لەپڕ ئەکتوش یەك بەخۆی و دڕندانە کەوتە وەڕین. سوڵتان مراد سەری بەرز کردەوە و داسەکەی لە دەست بەربۆوە و هاواری کرد:

- حاجی مراد، تەماشاکە، رێوی!

لەو پێشەوانە لەسەر بەفرە بەستوەکە رێوییێك لەترسی سەگەکە رای دەکرد و لەگەڵ راکردندا سەری بۆ دواوە دەسووراند و کەمێك دەوەستا. رێویەکە ئەوەندە بەسەری رەحەت و ئازادیەوە رای دەکرد هەر دەتگوت لەسەر بەفرەکە دەخزێ. ئەم رێویە تەواوەك گەورە بوو، گوێیە رەشە بەبریقە و پشتی دووکەلیەکی سوور وکلکێکی درێژی هەمان رەنگی هەبوو.

---

(٢٧) مەحچەچە: دەنکە خرنۆکی وشك.

ئەکتوش بە تووڕەیی و ناراستەوخۆ سەری بـەدوادادەنا بـەڵام هەرچـەندەی زێـتر ورژمـی بـۆ نێچیرەکە دەبرد، زێتر لەبەفرەکەدا دەچووە خوارێ
حاجی مراد قیژاندی :
- بیگرە، ونی نەکەی — ئەوان بەتەکانان و داس بەدەستەوە بەرەو رێویەکە رایانکرد.
هەرکە رێوی دیتی مرۆڤ بەراکردن سەریان لەدوا ناوە بەتونـدی بـۆدواوە سـووراوە و خـۆی کوتا پشت پنچکێکی دڕکاوی کاتێك ئەکتوش بەرۆخ رێچـکەکەی پێشـوی ئـەودا رای کـرد، رێویەکە بەرەولای پێچەوانەوە رای کرد. هەڵبەتە رێوی بە ئاسانی دەیتـوانی تاقیـب کـەرانی خۆی فریو بدا بەلاّم بەدبەختی ئەو لەوە دابوو رێگای بە نشێوێك کەوت، کە لەوێدا قـەڵش و رۆچوونی وا کە وەك دیواری رێك و راست و خەرەندان، کە نەدەکرا لێی دەرباز بـێ، کۆتـایی دەهات.
وادەهاتە بەرچاوان کەئیدی رێویەکەناتوانێ دەربازبێ. ئەگەر ئـەو سـەگە دەم پـڕ لەحـەپ حەپ و وەڕە وەڕە نەدەبوو لەپەناوبن پنچگ و دڕیان ون دەبوو و ئەکاتە چ کەسـێك دەیتـوانی لـەبن دڕی پنچـکە و دڕکاویـەکان بیبیینتێـەوە. بـەلاّم سـەگەکە هەرچـەندە کـەم عـەقڵ و هەرچەندەهی ماڵەوە بوو. هەناسە درێژوشوێن پێ هەڵگروو. یەك چرکە چـییە لـە حەپەحـەپ نەدەکەوت و هەرئەم وەرینەش بوو رێویەکەی ترساند. بەلاّم هەردوو براکەکە شەیدای رووداوە چاوەرێنەکراوەکە بوون ولەخوشیان گریان گرتبوو وسەرقاڵی هـاوار هـاوار و شـۆرو هەلچـونی تاقیبکردنی رێویەکە بوون بـەگیانی ئارەقاویـەوە وەك بـا رایـان دەکـرد. تـەنیا ئەوەنـدە لـە بەردەمی رێویەکەدا مابۆوە، کەیان خـۆی بەدەسـت لـوتفی سـەگەکەوە بـدا ویـان لـە نزیـك کوڕەکانەوە بەرەو خەرەندە کە ڕابکا. ریویەکە تەمشایەکی دەوروبەری خۆی کرد و لە جیـاتی ئەوەی لێیان رابکا بەرەو ئەوان رای کرد. منداڵـەکان لـەم روداوە چـاوەڕێ نـەکراوە وەسـتان. رێویەکە بەبێ پەلەکردن لەسەرلێواری پشتیە بەفرەکەیەوە بۆ کەلێنی قلێشێکی نزیـك دەبـۆوە هەروەك ئەوەی حسێبی بۆتوانای ئەکتوش کردبێ، کە لەناوبەفرەکە بەهەناسـە برکێـی سـەری لەدوانابوو. ئەکتوش بێچارە لە وەڕەو ڕاکردن کەوتبو و هەستی نەکرد، کە رێویەکە ئـەوی بـۆ سەر بەفرێکی بەستوی قووڵ راکێشاوە. برایەکانیش هۆشێکی وایان دەرنەخست. هەردووکیان شێت و شەیدای تەلەسمێکی عەجیب ببون، کەلە بەرئـەوان رای دەکـرد. ئـەم رێویـە لـەکاتی راکردنیدا ئەوەندە جوان بوو و لە بەلەمێك دەچوو کە بەخێرایی لەگەڵ تەوژمی ئـاودا قـەراری گرتبێ. رێویەکە بە تەواوی لەنێوانی ئەواندا رای دەکرد.

وەك ئەوەی هەولبدا بەنێوانیاندا تێپەرێ تاهیچیەكیان نەرەنجێن. بەڵام دوای کەمێك بۆی دەرچۆوە کەمێك لای چەپی گرت و هەردووسێ هەنگاو بەولاتری سولتان مرادا رەت بوو. لەم دەرفەتە دا سولتان مراد لە نینۆکی پێی ی تا تەپلی سەری دیت و تەماشاکرد. وەك ئەوبوو، کە خەو ببینێ. ئەو بەوشتەی، کە دەیدیت باوەڕی دەکرد و نە دەکرد. رێوی کاتی رەتبوون بە نزیکیدا. بە سەروملێکی کشاو چاوێکی رەشی بەبریقەوە تەماشای ئەویکرد. سولتان مراد لەم تەماشا عاقلانەی گیانلەبەرەکە سەری سوورما. تێکرای ئەمانە کە بەسەرێکی قیتبۆوە و بەرزکراوەوە و کلکێکی رەپەوە و مەشکێکی سپی لێل، نینۆکی رەشی پڕلە جولەو نیگاییێکی عاقلانەوە هەموو شتێك بەراورد دەکاو لێك دەداتەوە و هەلدەسەنگێنیێ، لە مێشکی ئەودا نەخشیان بەست... . .

ئەو دەیزانی، کە سولتان مراد دەستی بۆ ناهێنێ ئەو وەختێ بەئاگا هاتەوە، کە حاجی مراد داسەکەی ئەنگاوتە رێویەکەو هاواری کرد:

- لێیدە! لێیدە!

سولتان دەستی بەهیچ رانەگەیشت و رێویەکە بەخێرایی خۆی کوتایە ژێر پنچکەکانەوە (١) و ئەکتوش سەری لەدوانا و هەردوکیان بەخێرایی بەرەو خوارەوەی دۆلەکە چون و دورکەوتنەوە.

سولتان مرادی، کە لەسەرسامیان مات ببوو گوتی:

- ئای کەباشە! دەستخۆش!

هەردوو برا رایان کرد و راوەستان. هیچ شوێنەوارێکی رێویەکەیان نەدیتەوە. و تەنیا ئوکتوش جارێك لەم لاو جارێك لەولا وەڕەوەرێکی لێهەلدەستا. لەدواییدا حاجی مراد بەبرایەکەی گوت:

- عەجەب مرۆڤێکی، رێوییێکی ئائەوهات لە دەستدا. راوەستای و هەردەستیشت بەرز نەکردەوە.

سولتان مراد نەیدەزانی چی وەلاّمی برایەکەی بداتەوە. برایەکەی حەقی بوو.

سولتان مرادبۆلەیەکی کرد:

- بە چ دەردێکت رادەگا؟

- حاجی مراد گوتی:

- چۆن بە دەردم راناگا. و بەبێ ئەوەی ئەم وەلاّمەی خۆی روون بکاتەوە

دەستی بەمانای (ئای هەی وێلیکە) راوەشاند.
لەدواییدا بە بێدەنگی باوەشە پووش وپەلاش و پنجك و شورکەکانیان لە شوێنێکدا کۆ کردەوە.
دەبووایە هێشتا کەمێکی دیکەشی چیلکەو چاڵ ببەن تا باری تێرو پڕ ئامادە بکەن. لەم وەختەدا حاجی مراد بەرەنجاویەکەوە کەوتە قسە!
- دەڵێ ی بۆچی! دەکرا کلاوێکی کەوڵ لە کەوڵە ڕێوی بۆ باوکمان بدوورین وەك کلاوەکەی خاڵە نورگزی. بەڵام تۆ هەر وەستای.
سوڵتان مراد ماتێك بردیەوە. ئەو تێگەیشت، کە براکەی کاتێ بەدوای ڕێویەکە کەوتوە بیری لەچی کردۆتەوە. ئێستاش، کە کار لەکار ترازاوە داخی بۆ ئەم مەوزوعە هەڵکێشا، کە نەیتوانی ئەم ڕێویە جوانە بگرێ.
دەم و دەست بەکلاوی لچك درێژی تا بنا گوێ و گەرمی وەك نورگزی باوی هاتەوە بەرچاوی. بیرکردنەوە ی حاجی مراد بە دەنگی هوقەهوقی گریانی حاجی مراد پسا. برایەکەی لەسەر باوەشە پووش و پەلاشە، کە دانیشت و سەری لە گریان نابوو.
سوڵتان مراد لێی نزیك بۆوە و گوتی :
- چیە؟ چی بووە؟
ئەو بە گریانەوە وەڵامی داوە :
- هیچ نەبووە.
سوڵتان مرادیش هەندەی لەسەر نەڕۆیی و بەبیری هاتەوە، کە ماوەیەك پێش ئێستاش کاتێك، کە خاڵە نورگزی هاتەلایان حاجی مراد بەمجۆرە گریا و یەکسەر لە حاڵەتی گریانەکەی ئەو گەیشت، کە ئەو لە دڵتەنگی خۆی بۆ باوکی دەگریە. ڕێوی و کلاوی کەوڵە ڕێوی، تەنیا هۆیەك بوو بۆ بەیادهێنانەوەی.
سوڵتان مراد نەیدەزانی چۆن دڵی براکەی بداتەوە. ئەویش خەم دایگرت بە تێگەیشتن و دەرککردنێکی قوڵی ڕەنج و خەمی براکەی وای بڕیار دا. مەحرەمانە ترین و پیرۆزترین بیرو هەستی خۆی لەگەل ئەودا باس بکا. بۆیە لەتەنیشتی دانیشت و گوتی :
- حاجی، تۆ مەگریە. من دەمەوێ کاتێك باوکم دەگەرێتەوە ژن بێنم.
حاجی مراد ژیر بۆوە و بە واقوڕماویەکەوە تەماشاییێکی براکەی کرد:
- دەتەوێ ژن بێنی؟

- بەڵێ، ئەگەر تۆ لەکارێکدا یارمەتیم بدەی.

حاجی مراد، کە باسەکەی بەدڵ بوو سرنجی راکێشا بوو گوتی:

- لە کامە کاردا؟

- بەڵام نابێ تۆ یەك ووشە بۆ کەس باس بکەی؟

- زۆر باشە

ئێستا سوڵتان مراد دوو دڵ بوو لەوەی پێی بڵێ یان نا؟ ئەو بە سەرلێ تێکچوونێکەوە بێدەنگ بوو. حاجی مرادیش وەك گەنە پێوەی نووساو وازی لێنەهێنا.

- چ کارێك، بڵێ، چ کارێکە، سوڵتان مراد. بڵێ بە شەرەف، یەك وشە بە هیچ کەسێك ناڵێم.

سوڵتان مراد نقومی ناو ئارەقە بوو و بەبێ ئەوەی سەیری دەموچاوی برای بکا بە زەحمەتێکەوە کەوتو قسە :

- دەبێ لە قوتابخانە کاغەزێك بگەیێنییە کچێك.

حاجی مراد زیت و زرنگ خۆی لە براکەی نزیك کردەوە و پرسی :

- کام کاغەز، لەکوێیە، نیشانم دە.

- لە دواییدا پێت نیشان دەدەم، لێرە نییە.

- ئەدی لە کوێیە.

- لە جێگایەکە، لە دواییدا دەیبینی.

- تۆ دەیناسی، لە دواییدا پێت دەڵێم.

- دە باشە پێم بڵێ.

- نا دوایی پێت دەڵێم.

حاجی مراد وا بەئاسانی وازی نەدەهێناو گۆری باوکی مرۆڤی دەردەهێنا. سوڵتان مراد ئاهێکی قووڵ و گرانی لە دەست حاجی برای هەڵکێشا و بەزۆر و پچڕ... . پچڕ گوتی:

- دەبێ کاغەزەکە... . دەزانی... . بەکێ... بدەی... بە... میرزاگوڵ.

- کام میرزاگوڵ؟ ئەوەی لە پۆلەکەتانە؟

- بەڵێ.

حاجی مراد یان لە خۆشحاڵیان و یا لە روی زۆڵێتی و کەف و کوڵێکی منداڵانەوە یەك بەخۆی هاواری کرد :

- هۆیها ! من دەیناسم. دەزانی ئەو چۆنە؟ وادەزانیٚ، کە زۆر جوانە ! لەگەڵ قوتابیانی پۆلەکانی خوارەوەی پۆلەکەی خۆی قسە ناکا. براکەی لێی تووڕەبوو:

- بۆ وا هاوار دەکەی؟

- باشە، دەباشە دەی هاوار ناکەم. تۆ ئەوت خۆش دەویٚ؟

- بەڵیٚ؟ - وەك ئاچورك و سەمەتی، بەڵیٚ؟ (ئیچورك وسەمەتی ناوی ئاشق و ماشومانی ناو داستانی (ماناس) ن ).

سوڵتان مراد هەندێکی بەسەر براکەیدا قیڕاند :

- بیبڕەوە.

- حاجی مراد کەوتە ئازاردان :

- مەگەر چی بووە؟ قسە نەکەم

- هاوارکە، چاك هاوارکە. ئێستا بڕۆ سەر ئەو کێوانە هاوارکە، بە هەموو خەڵکی بڵیٚ !

- دەچم و هاواردەکەم، کە تۆ میرزاگوڵت خۆش دەویٚ، دەی، دەباشە هاوار دەکەم، خۆشت دەویٚ... .

ئەم بەدخوییەی برابچوکەکە، براگەورەکەی بێزار کرد و دەستی کێشاوە و زللەییێکی چاکی تێسرەواند. ئەویش لچی شۆرکرد و دەستی کرد بە گریان، بەڵام گریانێکی وا دنیای پڕ کردبوو.

حاجی مراد بەهەموو هێزی خۆی هاواری کرد.

- بابم لە جەنگە و تۆش لە من دەدەی؟ راوەستە ! راوەستە ! پێت نیشان دەدەم !

ئێستا دەبووایە ئارام بکرێتەوە. چ بەدبەختیەکە. هەرکە ئەوان ئاشتبوونەوە حاجی مراد بەگرژی و نوزەنوزەوە بە دەم ئەوە وە هێشتاش بە هەردوو مشتی فرمێسکەکانی پاك دەکردەوە و بە دەم و چاوی بە فرمێسکانەوە تەڕ بووی هێور بۆوە و گوتی:

- مەترسە من بە کەس ناڵێم و هەتا بە دایکیشم ناڵێم، تۆ لە خۆڕا لە منتدا.

... . بەڵام کاغەزەکە دەگەیێنم. من دەمویست ئەوەت پیٚ بڵێم بەڵام تۆ رانەوەستای و لێت دام. لەکاتی پشوودان دەیدەمیٚ. بانگی دەکەمە لاییێك. بەڵام لەباتی ئەمە کاتیٚ کە باوکم دێتەوە و دەگاتە ویستگەکە و هەمویان بۆ پێشوازیی ئەو رادەکەن، تۆ من لەگەڵ خۆت ببە. بەجووتە سواری جابدار دەبین و تاوی دەدەین و پێش هەموان دەگەینە باوکم. تۆ

و من.  خۆ جابدار ئێستا هی تۆیە.  تۆ لـە پێشـەوەو مـن لـە دواوە سـواری دەبـین و تـاوی دەدەین.  یەکسەر چابدار دەدەینە بابم و خۆشمان لە تەنیشـتی دا دەڕۆیـن.  ئـەو کاتـە دایـەو هەمو خەڵکە، کە بەخێرایی بۆ پێشوازیمان دێـن.  حـاجی مـراد وەك گازانـدە بەدڵشـکاوی و پاڕانەوەیەکەوە ئەم قسانەی کرد و کاریگەرییێکی وایان لەسەر سوڵتان مراد دا بەجێهێشت، کە سوڵتان مراد خۆی بەزەحمەت توانی بەری فرمێسکەکانی بگرێ.  ئەو گڕی گرتبـوو لەپێسـتی خۆی چوبووەدەر و ئێستا زۆر لەو زللە پەشیمان بوو، کە لەبن گوێی برایەکەی دابوو.

-      زۆر باشە جاجیلۆکەکەم،  تۆ مەگری پێکەوە بەسواری ئەسپ بەتاو دێـین و دەچـین. تەنیا بوەستە تا بابە دێتەوە.  ئەو حەلەی هەمـوو پووش و پەلاشە دوراوەکانیان کۆ کـردەوە و چاکیان بەستن سێ دەستە چیلکەو چاڵی تێرو پڕ بوو.  سوڵتان مـراد زۆر لێهاتوانـە دەیتـوانی هەر سێ با بارەکە گوریسس پێچ بکا،  یەکەم کۆمەڵ گەورەیە هێندەی گردێکە مرۆڤ دەترسێ نەتوانێ بیگەیەنێتەوە ماڵ بەڵام  خۆ ئەگەر کەسێکی شارەزاو لێهاتوو بیپێچێتەوە ئەوا بگـرە سێ کۆلەکە بچوکتر دەبنەوە.  بارێکی، کە بەباشی پێچرابێتەوە باشتر لەسەر کۆڵێ گیر دەبـێ و هەڵگرتنی ئاسانە.  ئەمجارە منداڵەکان دوو کۆڵیان بۆ بارکردنی ولاغەکە ئامادە کـرد،  بـۆ ئەمەش پاڵ رەشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو،  کۆلێکی دیکەشیان ئامـادە کردبـوو و سـوڵتان مراد بڕیاریدا ئەمەیان بەکۆڵی خۆی دادا،  هەر چەندە، کە رێگاکە دوربوو بەڵام  باشـتر بـوو هەموی پێکەوە بباتە ماڵەوە تـاوەکو سـووتەمەنی زۆرتـر لەماڵـەوە هـەبێ.  جگـە لەمـە، بەجێهێشتنی پـووش و پنچـکێکی وا مـەخابن بـوو.  ئـەوان سـووتەمەنییەکی باشـیان لـە کەلێنەکانی تویوك جاڕ کۆ کردبۆوە.  پاڵ رەشیان وا بارکرد، کـە نـە کلـك و نـە گوێیـەکانی دیارنەمابوون،  حاجی جڵەوەکەی ئەوی رادەکێشا.  سوڵتان بە دەم هـەڵگرتنی بـارە چـیلکەو پووشەکە داهاتبۆوە.  کۆڵەکەی بە شێوەی زەڕب لە کۆڵی خـۆی بەسـتبوو،  بـەدوای ئەوانـدا دەهات.  ئەمجۆرە بەستنە ئاوهایە، کە کندرەکە لە ژێـر هـەنگڵی چـەپەوە بەسـەر سـینگەوە بەبنهەنگڵ و لاشانی راستی دادەکێشرێ و لەلای راستی پشتەمل بە ئەلقەیەکی یان قفلێکـی بەسەریەکدا خز دەبەسترێتەوە، کە سـەرەکەی بەدەسـتی کـۆڵ هـەڵگرەوە دەگـیرێ.  بـەمجۆرە کۆڵهەڵگر دەتوانێ لەگەڵ بەرێگا رۆیشتنەکەیدا هەر کاتێ پێویست بکا گرێیەسـت بۆوەکـانی بارەکە راکێشی و گورجی بکاتەوە.  ئەوان هەرهەمان شێوە،  حاجی مراد لە پێشەوە حڵـەوی جاشولکەکەی گرتبووە دەست و سوڵتان مرادیش لە دواوە بە خۆی و کۆڵەوە،  رێیـان دەکـرد. ئەکتوش زۆر ماندو ببوو لە بەرئەمە هەر لەردواوە بەجێ دەما. هەر کە مـرۆڤ بـاری چـیلکە

دەکێشن زۆر گرنگە ئەگەر ماوەییێکی زۆر دوورودرێژ نەحەسێنەوە. دوای حەسانەوەی یەکەم ماوەی حەسانەوەکانی دواتریان کەم و کورت دەبێ، حەسانەوەی دووەم لە نیوەی ماوەی یەکەم و پشووی سێیەم لە نیوەی ماوەی دووەم و... . . هتد

سوڵتان مراد شێوازەکە باش دەزانێ. لە بەرئەمە بە پێی هێزوتوانای خۆی، بە هەنگاوی هەماهەنگ و گەورە دەرۆیشت. لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی هیچ شتێك لە دەوروبەری خۆیدا ببینێ، تەنیا تەماشای بەردەمی خۆی و پێش خۆی دەکرد. بۆ ئەوەی مرۆڤ لەکاتی بارکێشاندا تاماوەییێکی زۆر ماندو نەبێ و چاوەڕێ ی ئیسراحەتی زوزو نەبێ. لە هەمووشتێك باشتر ئەوەیە بیر لە شتێك بکاتەوە. ئەو بە دەم ڕێگاوە بیری دەکردەوە، کە بەیانی چۆن چۆنی بۆ سەرکارەکەی دەچێتە حەوشەی تەویلەکەوە سەر لەنوێ فەرمانی فەرماندەیی دەستەی زەبروەشێن لە ئەستۆ دەگرێتەوە. وەختەکە بە خێرایی بەسەر دەچوو. چونکە تا وەختی چون بەرەو ئەکسای، چەند رۆژێکی، کە بەپەنجەکانی دەست دەژمێردرا، لەبەردا مابوو. ئێستا ئیدی ئەسپەکان هاتبوونەوە سەرخۆ و چارەسەریان کرابوو گاسنەکان و هەوجارە یەدەگەکان و کەلوپەلی جووت و کێلاَن ئامادە بوون بەهەر شێوەیەك کاتێك، کە مرۆڤ لە کێلگە دەکەوێتە کارکردن لەو کارانەی، کە جێبەجێ و ئامادە نەکراون بەئاگا دێتەوە. هەروا بووە. ئەمانە قسەی چکیشی سەردەستەن. چکیشی دەڵێ : چاو ترسنۆك و دەستەکان بوێرن. دەبێ نەترسی و رووڵەکێڵگە بکەی. لەوێش لەکاتی کارکردندا دیار دەکەوێ چۆن چۆنی و دەبێ چیبکەی، نابێ پێشبینی هەموو شتێك بکەی. رەنگە ئەو راست بکا و هەقی بێ.

سوڵتان مراد لەم بیر و بیرکردنەوانە دابوو، کە دەبێ چی بکا تا ژیانی دایکی رحەت و ئاسان بکا. بەتەواوی تێمابوو. لەلایەك شیری دەدۆشی و گایەکانی ئالیك دەدا و لەلایەکی دیکەش هەناسەییێکی رحەت هەڵناکێشێ. دەبێ بەتەنیا خۆی هەموو کارەکان بکا. زۆپا داخستن، چێشت لێنان و جل شوشتن هەر هەموی لە ئەستۆی ئەو دان. کچۆڵەکان هێشتا بچکۆلەن. هیچیش لە حاجی مراد چاوەڕێ ناکرێ. خودی سوڵتان مراد ئێستا لە ماڵ و بنەماڵەکەی دابڕێنراوە بەم زوانە بەرەو ئەکسای دەڕوا و کێ دەزانێ کەی دەگەڕێتەوە. دەبێ چەندە زەوی و زار بکێڵن و چەنیش خەریکی سەراوکردن و نەرمکردنەوەی کێڵگە بن ! لە کاتێکدا، کە ئەوان هەر تەنیا پێنج دام و دەزگای گاسنیان هەیە ! تەواوی ئەسپەکان و گاسنەکانی لە زەویە کۆنەکان لە کاردان. لەم زەویانەدا کار زێتر هەیە. بەلاَم ئەمە

لایەنێکی باشی ئەوەیە، کە لە ئائیل نزیکە. ئەگەر پێویست بکا ژنان دەتوانن بـێلان بگرنـە دەست و کۆمەکیان کەن. هەرچەندە، کە کاری ژنان نییە. بەڵام ئەوانیش ئێستا جۆگـەی وا هەڵدەکەنن، کە تا کەمەران قوڵە. هەم ئاو بۆ کێڵگـەکان دەبـاو هـەم بەربەسـتیش دروسـت دەکا. لەبارەی ئەمەوە، کە چۆن ژیانی دایکی نەختێ ئاسان بکا، شتێکی بەخەیاڵدا نەهات. بەڵام ئەو پتر لە هەموشتێك لەم بارەوە بیری کردەوە کەبەیانی نامـە بـۆ میرزاگـوڵ دەنێـرێ. پێویست بوو، کە شیعری گۆرانی (کۆتری سپی)ی بەتەواوی بنووسیبا. هەوڵیدا وا لەمیرزاگوڵ بکا لەکاتی خوێندنەوەی کاغەزەکەی هەمان بیرو خەیاڵی سـوڵتان مـراد بێنێتـە بـەر چـاو و خەیاڵی خۆی. نووسینی نامەی دڵداری عەجەب سەختە. شتێکی وای لێدەردەچێ، کە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئەوشتەی، کە مرۆڤ ویستوویەتی بینووسـێ تێـك ناکاتـەوە. هـیچ کاغـەزێك ناتوای ئەوەی، کە لەدڵی مرۆڤدایە لە دووتوێ ی خۆیدا جێگا بکاتەوە. تا بزانـی میرزاگـوڵ چی دەڵێ. دەبێ ئەویش وەڵامێکی بداتەوە. ئەدی چی؟ لەکوێوەبزانێ، کە ئـەویش خۆشـی دەوێ یان نا؟ ئەمە خۆی شتێکی نادیارە. ئەگەر ئەو نەیەوێ سوڵتان مراد خۆشی بوێ چـیە؟ ئەوساکە چۆن دەبێ. زۆر دەمێك بوو ئاوا دەبوو و هەتاو لە پێشەوەو لـە تەنیشـتەوە لەیـەك لای دەم و چاوی دەدا. زەمین هەمان هێمنی و گەورەیی. زستانی پاراست بوو. پێش لافـاو باو بۆران ئەوهایە و هێمنی و چێژوتامی بێدەنگی باڵ بەسەرشـوێنەکەدا دەکێشـێ. ئەمانـە هەموویان لەیەك چرکەدا تێك و پێك دەچێ و وردوهەڕا دەبێ و تەخشان و پەخشان دەبێ. لەم کاتانەدا دەبێ ئەم وێردە بخوێندرێ (بەلا دوربـێ، خێربـێ) تـا گیانـە پـیس و شـەرانییەکان دووركەونەوە. هەندێ جار بەخێر دەگەرێ. سوڵتان مراد لەحاڵێکدا بەوردی تەماشـای پـێش خۆی دەکرد تا جێگاییێکی گونجاو بۆ پشودان ببینێتەوە بەئاسانی بتوانرێ لەوێ لەجێگای خۆی راستبێتەوە. بارکێش کاتێك بەسەر پشتدا بارەکـەی لـەکۆڵ بگرێتـەوە دەبـێ بەیـەك تـەکان راستبێتەوە و بکەوێتە سەر ئەژنۆیان و ئەم تەکانەش نابێ زۆر توند بـێ، چـونکە ئەگـەر لـە پێویست زێتر توندبێ، بارەکە بەسەر سەریدا دەکەوێ و بارکێشیش وەك بۆق بەسەر زەویدا پان دەبێتەوە. دوایی دەبێ لەسەر قاچێك و ئینجا لەسەر قاچەکەی دیکەی بوەستێ و ئینجا دەبێ لەگەڵ خوێنـدنی جـادوی (ئـای. پیریـم) (١) هەرچـەندەی، کـە بارەکـە رێگـا دەدا کەمـەر راستبکرێتەوە. ئینجا زۆر بەئاسانی دەتوانرێ پشوبدرێ. تـەنیا دەبـێ بەبوێریـەوە خـۆت و بارەکە بەپشتا بێن لەکاتی وەستان بۆ پشوودان. سـوڵتان مـراد خـۆی خـۆی بەسـەر بارەکـە بەپشتدا خست و یەك چرکە چاوەکانی لێك نا. ئای کەچەند باش بوو، کە کندڕەکـەی لەسـەر

سنگی بەرەلاکرد ئەو کەیفی بەو حاڵە دەهات و حسێبی دەکرد، کە جێگای پشودانی داهاتو دەبێ لەکوێ بێ. ئەمەش مانای ئەوەیە چ کاتێك دەتوانێ دوای بڕینی ڕێگاییێکی دژوار دووبارە بیر لە میرزاگوڵ بکاتەوە؟ سوڵتان مراد بەبێ دەنگی و لەژێر لێوەوە بەخۆی پێدەکەنی و گوتی :

- تۆ تەنیا ئەوەبکە زو وەلامی نامەکەم بدەوە، گوێت لێیە یان نا؟

- گوێی هەڵخست.

لەسەروبەندانی شەودا، کە دنیا بەشێوەییێکی هەستپێنەکراو لەسەرەخۆ تاریك دادەهات و بێدەنگیەکی لە رادەبەدەر زۆر، باڵی بەسەر دەوروبەردا کێشابوو.

ئەو رۆژانە نزیك دەبوونەوە... .

چاوەڕوانی پڕ لە نیگەرانی و وەڕزکەری وەلامی میرزاگوڵ، تەواوی رۆژەکە تا وەختی شەو لە ماندوبوونێکی زۆر دەکەوتە ناوخەوێکی مردن ئاساوە، وازیان لێهێنا. ئەو بەهەر کارێکەوە خەریك دەبوو هەر کوێیەك دەچو لەم بارەوە بیری دەکردەوە. ئەو بەهەمو توانای خۆی کاری دەکرد و فەرمانی بەدەستەکەی خۆی دەدا. بەلام لە بیری خۆیدا تەنیا چاوەڕێ بوو، کە چ کاتێك حاجی مراد لە قوتابخانەوە بە ڕاکردن بۆ تەویلەکە دێ و وەلامە پڕ لەچاوەڕوانییەکەی دەهێنێ , ئەو وحاجی مراد ئاماژ و نیشانیان لە نێوان خۆیاندا دانابوو. ئەگەر میرزاگوڵ وەلامی داتەوە حاجی مراد دەبوایە بە خۆ هەڵبەزاندنەوە رابکا و دەستەکانی راوەشێنێ و ئەگەرنا ڕانەکا و بە ئاسایی بڕوا و دەستەکانی لەناو باخەڵی بنێ. سوڵتان مراد بەردەوام سەیری ئەوی دەکرد، بەلام هەموو رۆژێك برایەکەی لەناو باخەڵەوە دەهاتە لای ئەو و سوڵتان مرادیش دەم و چاوی پێکدا دەداو سەری لەوە دەرنەچوو، کە مەسەلەکە بەکوێ گەیشتووە. خەریك بوو توانای نەدەما. حاجی مرادی بەپرسیاران دادەگرت و دەپرسی، کە کاتێ میرزاگوڵی دیت چی گوت و ئەو چۆن چوەلای و چیان گوت. هەرکاتێك سوڵتان مراد دەهاتەوە ماڵ، دەیدیت، کە برایەکەی دەمێکە نووستوە. بەلام دیسانەوە حەزی دەکرد لەسەر هەندێ شتی ورد پرسیار بکا. بەلام پرسیارێکی تازەی نەبوو لێی بکا. بەدەردی سوڵتان مراد گوتەنی، ئەم میرزاگوڵە ناجسنە لە کاتی پشوودانەکان هەر هیچی پێ ی نەگوتوە و، خۆی وا نیشان دەدا بە جۆرێك، کە مانای هیچی نەدەداو هیچی لەیاد نییە. وەك ئەوەی نامەیەکی وەرنەگرتبێ. لەکاتی پشودانی نێوان دەرسەکاندا بۆ خۆی دەوەستاو لەگەل کچان قسەی دەکرد و ئاگای لە حاجی مراد نییە و تا حاجی مراد خۆی نەچێتە لای و دەستی

رانەکێشی ئاوڕناداتەوە تا تەماشای بکا. سولّتان مراد تێنەدەگەیشت، کە ئەمە مانای چیە. ئەگەر میرزاگولّ حەزنەکا کاری بەکاری ئەودابێ. بۆ وەلاّم ناداتەوە و بۆ لەو بارەوە شتێکی رێك و است نالّێ؟ بۆ بێدەنگ دەبێ، مەگەر نازانێ چاوەڕێ ی وەلاّم چەند پر ئەشکەنجەیە و چەند دژوارە؟ . سولّتان مراد بە دەم ئەم بیرکردنەوانەوە خەو بردیەوە. رۆژی دوایی تاقی بەیانییەکەی دیسان بیری لەم شتە دەکردەوە. ئیدی کات بۆ چاوەڕێکردن نامێنێتەوە. بەفر لەو دەوروبەرانە بەخێرایی رەش دەبێتەوە. بەخێرایی سەرما بەسەردەچێ و زەمین هەناسەی دێتەوە بەرێ و بەزویی یەکەم گاسن لە زەوی دەردێ. ئەو وەختە کار چەندە بەسەر مرۆڤدا دەبارێ. جارێك سولّتان مراد بە برایەکەی گوت :

- پێی بلّێ من بەم زوانە بەرەو ئەکسای دەچم و ماوەیەکی درێژم پێدەچێ....

وەلاّمەکەی بەیەك وشەهاتەوە : - (دەزانم). نە کەم و نە زیاد. کەوتە ناو لێکدانەوان. جارێکیان دەیویست بۆ قوتابخانە رابکاو چاوەڕێی زەنگی پشوودان بێ و ئەو ببینێ و خۆیشی بزانێ، کە تێکڕایی ئەوانە چ مانایەکیان هەیە. بەلاّم نەیوێرا. هەمو ئەو شتانەی، کە پێشتر سادە و ساکار دەهاتنە بەرچاوی ئەو ئێستا نەدەهاتنە کردنێ. ترس، نەوێران. شەرم و دودلّی و گومان وەك گۆڕانی ئاو وهەوای دەم نادەمی ناوکێوان گیانی ئەویان دەهێنا لەرزە. نەدەکرا واز لە کارەکەبێنێ، ئەوەندە کار هەبوو، کە ماوەی سەرخوراندنی نەبوو. بەدەرکەوت، کە بوونە فەرماندەی دەستە بەو ئاسانییە نییە. هەر لەسپێدەی بەیانییەوە تا رۆژ ئاوابوون هەر کار بوو، کار کۆتایی نەدەهات. هەرچەندەش وەختی رۆیشتن بۆ ئەکسای نزیکتر دەبۆوە ئەوەندەش گرفتاری و سەرقالّی لە ئاسماندا دەبارین. داهاتنی بەهار نەوەك هەر تەنیا کار وگرفتاریەکانی پتردەکردن بەلّکو ژیانی ئەوانیشی دەڕازاندەوە و دەبوژاندەوە و پڕ لە خۆشی و شادی دەکرد. لەسەر جۆگەی ئاوێ، بەهار بەئاشکراو رازاوە و جوانترو ئاسمان پان و بەرینتر ببوو. شەختە وەك بزربوونی دووکەلّ ونبوون. رووبار، کە سەرەکەی شەختە بەری دابوو بەخۆشییەوە دەرۆیشت و بەسەر چەوەلاّن و بەردەلاّنەکەی ژێریدا شۆڕ دەبۆوە. هەر وردکە بەردێکی ژێری بەرۆیشتنی خێرا و رەنگە سەوزەکەی ئاوی روبارەکە رەنگێکی رووناك وتاریکی بەخۆوە دەگرت. ئەسپەکان ئێستا بەحیلە حیل و بەرەوە لە ژێر سمەکانیاندا تنۆکە ئاویان بەهەوادا دەپرژاند و بەرەو رووبارەکە دەچون. مندالّەکانیش بەسواری لە نێویاندا هەر بەرەو ئەوێ دەچون. بە پرژانی پریشکە ئاوە ساردەکان خەندە وپێکەنین و لێك ترسان و راچەنین دەستی پێدەکرد. سولّتان مراد لەم سەرو بەندانەدا، کاتێك، کە لەسەر ئاوەکە بوو

میرزاگوڵی دیت. ئەوی لە بەردەبازی رووباردا دیت و لەشوێنی خۆی وشك بوو. لەبەرچی وشك بوو؟ میرزاگوڵ تەنیا نەبوو. چوار کیژۆڵە بوون. ئەوان لە قوتابخانە دەهاتنەوە. ئەو رەنگ بوو ئەوان نەبینێ. مەگەر خەڵکێکی کەم بەم رێگایە دادێ و دەچێ و لە بەردەبازەکە بە حەمبازان دەپەرینەوە. بەختی یار بوو. لەحالێکدا چابداری راگرتبوو، بە رێکەوت تەماشای کرد و ناسییەوە و لەشوێنی خۆی وەك کۆلکەدار وشك بوو. میرزاگوڵ لەبەردەبازەکە دەپەڕیەوە و ئەویش سوڵتان مرادی ناسیەوە. میرزاگوڵ لەکاتی پەڕینەوەی لەسەر بەردەکان بەم لاو بەولادا دەهات و بە دەستەکانی پارسەنگی خۆی رادەگرت و کاتێك، کە دەگەیشتە رۆخ ئاوەکە، کەمێك وەستاو جارێکی دیکەش بەرەولای سوڵتان مرادی روانی و هەر بەدەم ئەوەوە کە لەگەڵ کچەکانی دیکە لەوێ دوور دەکەوتەوە چەند جاری دیکەش ئاوڕی داوە و تەماشای دەکرد. هەر جارێك، کە سەری بۆ لای سوڵتان مراد دەسووراند، سوڵتان مراد ئامادەبوو بەراکردن بەدوای ئەودا، بەدوای ئەو خۆشیەدا بفرِێ، تا یەکسەر بەبێ لێشاردنەوە و هیچ ترسێك پێی بڵێ، کە چەندەی خۆش دەوێ و ژیان بەبێی ئەو ناکرێ ناوی ژیان بێ. و هەر جارەی جورئەتی ئەو بەشی نەدەکرد، هەر جارەی میرزاگوڵ ئاوڕی لێدەداوە ئەو دەمرد و زیندوو دەبۆوە. میرزا ئیدی لەگەڵ کچە هاوپۆلیەکانیدا لە سەری شەقامی ئارال لە چاوان ون بوو بەڵام ، بەڵام ئەو هێشتا چابداری لە ناوەڕاستی رووبارەکە راگرتبوو و ئەسپەکانی دیکە تێر ئاو ببوون و چوبوونە ئەوبەری رووبارەکە. منداڵەکان ئەسپەکانیان پێکەوە لەیەك رەوەدا کۆ کردەوە تا بۆ حەوشەی تەویلە بچنەوە، بەڵام سوڵتان مراد هەروەك خۆی لە جێگای خۆیدا راوەستابوو و وای نیشان دەدا، کە چابدار هێشتاش هەر ئاو دەخواتەوە... .

سوڵتان مراد لە دواییدا لەمبارەوە بیری کردەوە و سەری لە خۆی دەسوورما و جوێنی بە خۆی دەدا، کە بۆچی ئەوەی بەبیردا نەهاتوە، کە لەم رێگایەدا کاتێك، کە لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە، قسەی لەگەڵ بکا. خۆ لەوێ لە بەردەبازەکەی روبار هەمیشە دەکرێ وەك ئەوەی رێکەوتێك بێ پێی بگا. چۆن پێشتر هۆشی بەمە نەشکاوە؟ هەڵبەتە پێویستە مرۆڤ خۆی بێتە ناو کارەوە و بزانێ، کە لەمەڕ نامەکەیەوە چۆن بیرێك دەکاتەوە. سوڵتان مراد دوایی گەیشتە ئەوەی، کە ئەم تەرزە پەیوەندیانە دەکرێ هەموو رۆژێك بێنە پێشەوە، بەو مەرجەی برادەرانی دەستەکەی کەمێك درەنگتر ئەسپەکان بۆ ئاودان رەوانەی سەر ئاوەکە بکەن. سوڵتان بەزانینی ئەمە زۆر دڵگیر بوو، کە هەمو جارێك دوای ئەوەی ئەسپەکان لەوێ دوای ئاو خواردنەوەیان بۆ تەویلە پێش خۆیان دەدەن میرزاگولیش ئەو کاتانە لەوێ پەیدا دەبێ

و سولّتان مرادیش نەیتوانیبوو دەرك بەم شتە سادە بكا.  هەركە ئەم مەسەلە سادە و ئاسانە ئەو لە خۆرایی ئازاری دەكێشاو ناخۆشی دەبینی.  ئیدی بریاریدا، كە چاوەڕێ ی میرزاگولّ بكا.  بۆ رۆژی پاشی سولّتان مراد لە روبارکەدا خۆی گلخاند(١) و بە كوڕیژگەكانی گوت،  بە خێرایی دەگەڕێتەوە و دەیەوێ غارێك بە چابدار بدا و تكای لێكردن، كە دوای ئاو دانی ئەسپەكان دەمێك ئاگایان لە ئەسپەكانی دیكەی ئەو بێ و لەجێگاكانی خۆیاندا بیانبەستنەوە و ئالیكیان بدەن.  دیسانەوەش ئاناتای ! ئاناتای دوای ئاو خواردنەوەی ئەسپەكان هیچ پەلەییێكی بۆ گەڕانەوە نەكرد.

(١)گلخاندن : خۆدواخستن

و ئەوانیدیكەشی گیركرد.

ئاناتای بە تەو سەوە گوتی :

- من دەزانم تۆ چاوەڕێ ی كێ دەكەی.

عەجەب مرۆڤێكی ناجسنی !

سولّتان مرادیش گولّی بێ درك نەبوو و لەباتی ئەوەی لەسەرەخۆ وەلاّمێكی گونجاوی بداتەوە (دەزانی،  دەبزانە) چەند جارێك لەم قسە گرانانەی لە ئاناتای باركرد و پێی گوت :

- تۆ سیخوڕی فاشیستەكانی !

- كێ سیخۆرە؟  من سیخورم؟

- بەلّێ تۆ سیخوڕی.

- یالّلا دەی روونی كەوە و بیسەلمێنە.  ئەگەر من سیخوڕم با دادگای بیابان من لە سێدارە بداو ئەگەر وانییە دەمت دەشكێنم.  شەر هەلّگیرسا،  ئەوان ئەسپەكانیان بەرەو لای یەك لێخوڕی.  فشاریان بۆ یەك هێناو لەناوەراستی روبارەكەدا چەرخەلەیان دەدا.  ئەوان بە دەنگی پڕ هەڕەشەوە دەیاننەڕاند و بە تووڕەییەوە تەماشای یەكدیان دەكرد و یەكدیان لەسەر ئەسپ رادەكێشا.  مندالّەكان لەكەنار رووبارەكەدا پێدەكەنین،  رایاندەبوارد و هانیان دەدان و ئەوانیش وەك كەلّەشێری بەشەڕهاتو توندتر یاخەگیری یەكدی بوون.  ئاوی ئەو دەورووبەرە شلّپ و هوڕی بوو پڕیشك بەم لاو ئەولادا دەپڕژان.  سمی ئەسپەكان لەسەر بەردەكانی ناو ئاوەكە هەلّدەخزین و گیردەبوون و هەمو جارێك چی وای نەدەما بكەون.  ئەو كاتە ئاركین بەگ بەسەریاندا نەڕاندی :

- هێی کوڕینە ئەوە چیدەکەن؟ ئاهای بوەستن ! دیسان دەتانەوێ ئەسپەکان شـەپڕیوکەن؟ ها؟ ئەوان هەردوکیان بەخۆهاتنەوە و بگرە خۆشحاڵ بوون، کە بیانوییێکی ماقوول پەیدابووە و بەبێ هیچ چەند و چۆنێك لێك جیابوونەوە. بەڵام بەهەموو شێوەییێك مگێزیان توندوتاڵ بوو. کاتێك مندالەکان ئەسپەکانیان بەرەو تەویلە لێخوڕی هێشتاش سـولتان مـراد هـەر هەناسـە برِکێ ی بوو و بۆ ئەوەی بەرەبەرە خۆی هێمن بکاتەوە لە رووبارەکـە ئەسـپەکەی تـاودا و بـێ پسانەوە تەماشای رێگای دەکرد. هێندە دوور نەکەوتـەوە و بـۆ دواوە گـەڕاوە و ئـەو حەلـە میرزاگوڵی دیت. هەر وەك دوێنێ لەگەل دەستەخوشکەکانی دیکەی دەگەڕانەوە. ئـەوان بـۆ خۆیان دەرشۆیشتن و سەرقاڵی قسەی خۆیان بوون و کاریان بەسەر ئەوە دا نەبوو، کە لەم نـاوە شتێك نەمابوو کە لەبەر خاتری یەکێکیان شەڕو خۆشی پەیدابێ و کەسێك زەحمەتی دەکێشـاو خەمی لە یەکێکیان دەخوارد. دایکی سولتان مراد ماوەیەك پێشتر لە باری کوڕەکەی ترسـاو گوتی : (چیتە؟ ناکا نەخۆشبی؟ حال وبارت تێکچوە). سولتان مراد دایکـی هـێمن کـردەوە بەڵام خۆی دەستیدا ئاوێنەیەك. دەمێك بوو لە ئاوێنە تەماشای خۆی نەکردبوو، نەیـدەپڕژا لەخۆی بخەفتی. لەکۆتاییدا وابەدیاردەکەوێ زۆر گۆراوە. چاوەکانی دەدروشانەوە. دەم چاوی درێژوکە و ملی درێژ ببوو. وەك ئەمە بـوو، کـە دولۆچـی لـەنێوان برۆیـەکانی پەیـدابووبێ، سمێلیشی گوگرە(١)ببو، سمێلی لێ بەدەردەکەوتن، هەڵبەتە ئەگەر لە رووناکی تەماشابکەن، دەنا نادیترێن. ئەمە ئیدی لەو شتانەوەیە، کە بەتەواوی گۆڕاوە، ناناسرێتەوە. رەنگـە، کـە باوکیشی کاتێك، کە دەگەڕێتەوە یەکسەر نەیناسێتەوە...

ئەو بەسواری ئەسپەوە نزیکی بەردەبازەکە بۆوە و کاتی نزیـك بوونـەوەی تێبینـی ئـەوەی کرد، کە چۆن میرزاگوڵ دوو جاران بەرەو سەر رووبارەکەی دەڕوانی. رێك هـەر وەکـو ئـەوەی لەکەسێك دەگەڕا. هەرکە سولتان مرادی دیت لەم روداوە لە پڕە راچـەنی و کـەمێك وەسـتا، بەڵام دوایی بەپەلە لەگەڵ دەستەخوشکەکانی رۆیشت. ئەوان هەر وەك ئـەوەی شـتێك رووی نەدابێ، بەسەر بەردەبازی رووبارەکەوە کەوتنە بازدان و خـۆ هەڵـدان و بـۆ ماڵـەوە رۆیشـتن. بەڵام سولتان مراد بەپێچەوانەی ئەوانەوە رۆیشت وەك ئەوەی بۆ کارێك پەلە دەکا لە نێـوانی باخچە و دێبەرەکاندا هاتە سەر شەقامەکە تا لەبەر دەمی میرزاگوڵ دا سەردەربێنی. سولتان مراد ئەوی لەو سەری شەقامەکەوە دیت ئەو وەختە لەسەرەخۆ هات و هەرچەندەی ئەوان لێکتر نزیك دەبوونەوە زێتر ترسی لێدەنیشت. وایدەهاتە بەر چاوان، کە هەموو دانیشتوانی ئەو ناوە لە پەنجەرە و ناو دەرگاوە تەماشای ئەوان دەکەن.

(١)گوگره : بەو توکە نەرمانەی کەسەرەتای گەنجی بۆیەکەمجار لەجێگای سمێڵ دێن،

و سەرنجی هەڵس و کەوتی ئەوان دەدەن و هەموو چاوەڕێن ببینن، کە ئەوان چۆن دەگەنە یەکدی و ئەو چی بە میرزاگوڵ دەڵێ. بەڵام میرزاگوڵ ئەوەندە خێرا نەدەهات. سوڵتان مراد نەیدەزانی چی روی داوە و بۆ ئەوەندە ترس دای گرتوە. ئاخر خۆ هەرنەبێ لەپۆلێکدا پێکەوە دەخوێنن و وەرگرتنی شتێك لەئەو و یا هەتا رەنجاندنی ئەو بۆ سوڵتان مراد شتێك نەبوو.

بەڵام ئێستا بەترس و نیگەرانییەوە لەو نزیك دەکەوتەوە. ئێستا حەزی دەکرد، کە خۆی لەم پەیوەندی پێوەکردنەی لاچەپ بگرێ. بەڵام تازە درەنگ بوو. رەنگیش بوو، کە ئەو بەباری رۆحی سوڵتان مراد پەی برد بوو. کاتێك هێندەی نەمابوو پێك بگەن، میرزاگوڵ لەپڕ بەپەلە پەل کەوت و نەگەیشتەوە ماڵی خۆیان گەراوە و روی لە حەوشەی ماڵە هاوسێیەکەیان کرد. سوڵتان مراد دڵخۆش بوو و هەناسەیێکی خۆشی هەڵکێشاو زۆر سوپاسی کرد دیارە، کە بەتەنیایی بەیەك گەیشتن چەندە ترسناکە. بەڵام لەدواییدا خۆی بە ترسنۆك داناو سەرزەنشتی خۆیکرد شەو خراپ نووست و وەختێ سەحەران لەخەو بەئاگاهات دووبارە کەوتەوە بیری میرزاگوڵ و گفتی بەخۆی دا، کە ئەمرۆ بەهەر جۆرێکی، کە بووە بچێتە لای و بە راحەتیەوە قسەی لەگەڵدابکا و زۆر بە راشکاوی لێی بپرسێ ئایا نیازی هەیە، کە وەڵامی نامەکەی بداتەوە و کەی وەلامی دەداتەوە. ئەگەر نا پێویست بە ناخۆشی و رەنجان ناکا با ئەمە و هەر لەنێوان خۆیاندابێ، ویستی ئەوهای پێبڵێ. ئەو ئەو رۆژەی ئەم بڕیارەیدا بەم مەبەستە بوو جێبەجێی بکا. ئەو بەهەمان مەبەست جارێکی دیکە لەدوای ئاو دانی ئەسپەکان چووە سەر ئاوەکە. بەسواری چابدارەوە دەهات و دەچو. لە رۆخی روبارەکە چووە پێشتر و گەڕاوە و لەم بارەدا لە خۆڕا هەستی کرد، کە لەناو ئائیلەکە لەسەر بانانیش بەفر نەماوە، بەڵام لەسەر گردۆڵکەکانی ئەولا، کە بەدرێژی زستان بابەفری بەسەریەکدا کەلەکەکردبوو، هێشتاش وەك بەسەریەکدا پەسترابێ و پر لە پەڵەی رەش و خۆڵەمێشیەو هەر ماوە. پەڵەکان لەشێوەی ئەمیبا بوون، کە جارێك لە دەرسی ئاژەڵناسیدا وێنەکەیان لەدەفتەردا دەکێشا. دوێنێ تینعەلیۆف سەرۆکی کۆڵخۆز و چکیشی سەردەستە سەردانی دەستەی ئەکسایان کرد و چاویان پێیان کەوت. هەموو گاسنەکان ژمارەیان لەسەر دانرا و درانە جووتیارەکان. گاسنی ژمارە یەك دراوە بە سوڵتان مراد. لەدواییدا هەر یەکێك لە کوڕیژگەکان ئەسپ و دەزگای گاسنەکانیان لێك بەست و نیشانیان دان، کە چۆن کاریان پێدەکەن. دوای ئەوە نیشانیان دراوە، کە چۆن چوار ئەسپەکانیان بە هەوجاڕەکانەوە

دەبەستنەوە. ئەو کاتە هەموو پێنج دەزگا هەوجاڕو ئەسپەکانی جووتکاری لە یەك ریزدا ڕاگیران. بە شێوەیەکی گشتی ئەگەر لەدەرەوە سەیریان کرابا دیمەنێکی جوان و ئیلهام بەخش بەرچاو دەکەوت. وەك عارەبانەکانی تۆپ تەنیا لەجیاتی تۆپ هەوجاڕ بوو. ئەسپەکان بەهێز، جل و جۆر و ئەسباب تەواو و لێوەشاوە و گاسنەکان بریقەدار بوون. جووتێران هەریەکەیان لەتەنیشت دام و دەزگای گاسنەکانیانەوە لەبارێکی ئامادە وەستابوون. تینعەلیۆف سەرۆکی کۆلخۆز لە پێشی دەستەکەوە بەپەیکەرێکی ئامادەوە وەك فەرمانـدەی سوپا تێپەری. لەهەر یەکێك نزیك دەبۆوە و دەیگوت :

- باری ئامادەگی خۆت بڵێ !

- ئاگاداری دەدەم. چوار ئەسپی ناڵ کراو، چوار خاموتی بێ کەم وکوڕی، چوار گوریسی سەر پاڵوی ئەسپ، هەشت گوریسی بەستنی خاموت بەعارەبانەوە، یەك زین، یەك داردەست، هەوجاڕێکی دوو گاسنە لەگەل سێ جووت گاسنی یەدەك ئامادەی کارم. ڕێك وەك لەشکر ! تەنیا چکیشی سەردەستە نێو چەوانی گرژ دەکرد. هەڵبەتە دەبێ وابکا. پیرە. چۆن دەتوانێ لەپێویستی ئەم ڕێ و ڕەسمە بگا ! چاوپێکەوتن و دیدارەکە بەباشی بەڕێوە چوو. بەڵام لە دوولایەنی دەستەکە ڕەخنەیان هەبوو. تینعەلیۆف سەرۆکی کۆلخۆز هەموویانی بانگ کردە لای زین و جلی ئەسپی ئەرگش و گوتی :

- باشە، تەماشاکەن چ کەم و کوڕیەك لە جل و زینی ئەو دایە دەستەکە هەمویان هەموشتێکی دەزگاکەیان پشکنی و دەستیان پێداهێناو هیچیان بە بەرچاو نەکەوت. ئەوجا تینعەلیۆف گوتی:

- ئەدی ئەمە چیە؟ مەگەر ئێوە نابینن، کە پاڵووی ئەم ئەسپە پێچی خواردوە. ئەمانە، سەیرکەن. لەکاتی کارکردندا تسمەی پێچ خواردو تەنگەی ئەسپ دەسوێ. ئەسپ ناتوانێ سکاڵای ئەمە بکا. بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی تەنگەی دەئاوسێ و ئیدی ناکرێ هەوجاڕی لێوە ببەسترێ ئەوکاتە من ئەسپێکی زیادەتان لەکوێ بۆ پەیدا بکەم؟ من ئەسپی یەدەگم نییە. لەئەنجامدا دەزگای جووت و کێڵ لە بەر گوێ پێنەدان بێکار دەمێنێتەوە ! ئێستا خۆتان بلێن، ئێمە بۆمان هەیە ئەمجۆرە شتە ئاسانانە نەبینین. ئەدی بۆکی تێکڕای زستان تەدارەکاتمان کرد؟

هەمویان شەرمەزار بوون. لەبەر چی؟ لەبەر شتێك، کە لە ڕواڵەتدا بایەخێکی نەبوو. عەجەب باروزروفێکە، ها؟ تینعەلیۆف سەرۆکی کۆڵخۆز ئامۆژگاریی سوڵتان مرادی کرد :

- تۆ، کە فەرماندەی دەستەکەی فەرمانت بەدەستە هەر کاتێك بەر لە دەستکردن بەکار بپشکنی، کە چۆن ئەسپەکانیان بەستووە، تێگەیشتی؟

- بەڵێ، هاوڕێ سەرۆکی کۆڵخۆز.

خەوشی دووەمی، کە لەکەسانی دەستەکە گیرا، گرنگتر بوو. ڕەخنەکە فەرماندەی دەستەکەیشی دەگرتەوە. تینعەلیۆف سەرۆکی کۆڵخۆز لێی پرسین :

- وەڵامم بدەنەوە. شەو دوای کارکردن دەبێ جل و جۆری ئەسپەکان لەکوێ دابندرێن؟

منداڵەکان بیریان کردەوە و بیریان بۆ زۆرشت چوو و وەڵامی جیاجیایان داوە. گەیشتنە سەر ئەو بیرە، کە لەدەبێ لە کێلگە لە کەنار هەوجارەکان بەجێ بهێڵدرێن.

- فەرماندە، تۆ ڕات چیە؟

- منیش هەر لەو باوەڕەدام. هەر لەو گوریسەی، کە ئەسپەکان لەگاسنەکە دەکەینەوە هەر لەوێ لەرۆخ هەوجارەکانیان دادەنێین. خۆ نابێ لەگەڵ خۆمانیان ببەین.

نەخێر ڕاست نییە. نابێ شەو جل و جۆر لە کێلگە بە جێبهێلدرێ. نەوەك لەبەر ئەوەی، کە ڕەنگە کەسێك بیبا. لە ئەکسای کەس نییە، کە ئەوە ببا. لەبەرئەوەی ڕەنگە شەو ببێتە بەفر یان باران و جلەکان تەڕبن. چەرمی جل وکەل وپەلەکان بە تەڕی و شێ لۆچاوی دەبن. هەروەها ڕەنگە ڕێوی یان مشکی خورما(١) لەسەر کێلگە بیان جون. تێگەیشتن مەسەلەکە چیە؟ گاسن لە کێلگە دا دەمێنێتەوە. ، کە ئەسپەکانتان کردەوە دەیهێننەوە شوێنی بنکەکەمان، ئێوە خێوەتتان هەیە کەلەناویدا دەژین. تەنیا یەك خێوەتە. من خێوەتێکی دیکەم نییە. هەرکەسێك دەبێ کەل وپەلی ئەسپەکانی لەگەڵ خۆی بباتەوە ناو چادرەکەوە و بەرێك وپێکی لەکوێ دەنوێ لەوێ ی دانێ. تێگەیشتن؟ دەبێ لە پشت سەری خۆتانیان دابنێن، هەر وا باو بووە. کەلوپەل چەکی ئێوەیە. دەبێ هەر سەربازێك زێتر لە هەمووشتێك و بەر لەهەمووشتێك ئاگاداری چەکەکەی بێ.

ئەو ڕۆژە تینعەلیۆف لەپێش دەستەی ئەکسایدا، کە بۆ دیدار لەئامادەگی تەواوی جەنگیان ریزیان بەستبوو، ئەم قسانەی کرد. تینعەلیۆف لەسەر و بەندانی ڕۆیشتنی دەستەی ئەکسای ئەم قسانەی کرد. ڕۆژەکانی کارکردن لە ئەکسای نزیك بۆتەوە و، هەمو کار و پێداویستییەکان بۆ ئەو ڕۆژانە ئامادە کراوە.

تینعەلیۆف سەرۆکی کۆڵخۆز بەم شێوە ئامۆژگاریکردن و تکای لێکردن. بەتەواوی ڕەنگ بوو لەدوای سێ چوار ڕۆژی دیکە ئەگەر هەواکەی تێك نەچێ، ئەوا بەرەو ئەکسای بەرێکەن.

ئەو وەختە هەڵبەتە تاهاوین نەیدەتوانی میرزاگوڵ ببینیّ. کاتێك، کە سولّتان مراد لەم بارەوە بیری کردەوە ترسا. گرفتێکی گەورەبوو مەحاڵیش بـوو وێنـای ئـەوە بکـا، کـە ئەگـەر دوور بەدووریش بووبیّ ئەوماوە درێژە میرزاگوڵ نەبینیّ. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو تازە دەیویست ئەمرۆ بە میرزاگوڵ بلّیّ، تۆ رازی یان نا !

(١)مشکی خورما : رەنگە جۆرێك لەمشك بێت یان گیانەوەرێکی دیکە

ئەگەر نا، باشە ئەگەر گوتی نا دووبارە گرنگ نییە. کار لەئەکسای گـرنگترە. سـولّتان مراد بەسواری ئەسپەوە لە رۆخ روبارەکەوە دەڕۆیشت و هەر تەماشای رێگای دەکـرد و تـەواو نارەحەت ببوو. کات رادەبورد. لەپڕ کچۆلەکان بەدەرکـەوتن. بـەڵام میرزاگوڵیـان لەگـەڵ دانەبوو. دەستە خوشکەکانی دەرۆیشتن بەڵام ئـەو دیـار نـەبوو. سـولّتان مـراد لەسـەرەتا نارەحەت بوو ئێستا، کە وایە دەبیّ چی بکا. ئەو بە هەمان مگێزی گیراو و تاڵ و توورە ببوو بە غەمباریەوە چوە حەوشەی تەویلەکەوە. بـەڵام لـەرێگادا نیگـەرانی روی تێکـرد. نـەکا میرزاگوڵ نەخۆش کەوتبیّ و یان شتێك رویدابیّ. ئەم نیگەرانییە زێتر دەبـوو. ئـەو هەسـتی کرد تا هۆیەکەی نەزانیّ بەهیچ جۆرێك ناتوانیّ ئارام بگریّ. بڕیاریدا لە کچـەکان سـۆراغێك بکا. سەری چابداری بۆلای ئەوان وەچەرخاند و لەهەمان کاتدا میرزاگوڵی دیـت. میرزاگـوڵ بەتەنیا لە قوتابخانە دەگەراوە. لە بەردەبازەکەی سەر رووبارەکە نێزیك دەبۆوە. سولّتان مراد کەمێك خێراتر لەچابداری خوڕی تا لە بەردەبازەکە لەگەڵ میرزاگوڵ ڕووبەڕوو بێتەوە. خۆشی ئەوەندە خۆشحاڵ بوو. لەم چەند دەقەیەدا کەوتبووە ناو خەیاڵ و لێکدانـەوە، کـە ئاگـای لـیّ نەبوو چۆن وشەی (عەزیزم! ) ی لەدەم دەرچو.

ئەو لەگەڵ میرزاگوڵ کەوتنە روبەروی یەکدی، لەئەسپەکەدا خۆی فڕێدا خواریّ، جڵـەوی ئەسپەکەی هەر بەدەستەوە بوو چاوەڕێی دەکرد، کە ئـەو بگاتـە ڕۆخ رووبارەکـە. میرزاگـوڵ بەچاو تێبڕین و دەمی بەخەندەوە بەرەو ئەو دەهات.

سولّتان مراد دەم پڕ لە دادوبێدادەوە پێی گوت :

- ئاگاداربە نەکەوی !

هەرچەندە نەدەکرا مرۆڤ لە جێپێەکی وا راست و ڕێك، کە بە بەردوبـەگیا وگـوڵ و رەگـی گیاو گوڵاّن دروستکرابوو، بکەویّ. چەند جوانە ئەو بێرەدا تێدەپەڕی. چەند باش بـوو، کـە بەسەر ئەم روبارە کێویەی، کە هەڵسانی بە هیچ پـرد و بـەرگیرێك نـەدەگیرا ! سـولّتان مـراد

چاوەڕێ ی دەکرد و. دەستی بەرەو ئەو درێژکردبوو و ئەویش بەردەوام تەماشای سولّتان مرادی دەکرد و پێدەکەنی و بەرەو ئەو دەهات سولّتان مراد جارێکی دیکەش گوتی :

- ئاگاداربە، نەکەوی !

بەلاّم ئەو هیچ وەلاّمێکی نەداوە و تەنیا پێدەکەنی و زەردەخەنەی دەگرت و بەمەش تەواوی ئەوەی، کە سولّتان مراد دەیویست تێی بگا گوترا : ئەو (سولّتان مراد)، کە سادە لەوح بوو، چەندەی نامە دەنووسی، چەندە زەحمەتی دەکێشا و چاوەڕێ ی وەلاّم دەبوو... . .

هەرکە میرزاگولّ دەستی بۆ لای ئەو درێژکرد سولّتان مراد یەکسەر دەستی گرت. چەندین سالّ لەگەلّ یەکدا لەیەك پۆل دەرسیان دەخوێند و تا ئەو هەلە نەیزانیبوو کەدەستی میرزاگولّ ئەوەندە میهرەبانە دەتگوت دەستی میرزاگولّ ئەوەی دەربڕی، کە (من لێرەم و چەندە خۆشحالّم، مەگەر تۆ هەست ناکەی، کە من چەندە خۆشحالّم؟ ) یەکسەر سولّتان مراد چاوی لە چاوی بڕی و سەری سوورما. لەناو بوونی میرزاگولّدا ئەو خۆی ناسیەوە. میرزاگولّیش وەك خۆی لەم ماوەیەدا بەتەواوی گۆڕاوە، گەورەبووە و بالاّی کردبوو و چاوەکانی بە جۆرێکی دیکە دەدرەوشانەوە و حەواسی پەرت بوو، رێك وەك حەواسی دوای نەخۆشی. میرزاگولّ وەك ئەوی لێهاتبوو چونکە (میرزاگولّ) یش هەمو دەم بیری لێ دەکردەوە و شەوانێکی زۆر خەوی لێ نەدەکەوت. چونکە ئەویش عاشق ببوو و ئەم عیشقەش ئەوی وەك سولّتان مراد لێکردبوو. وە ئەو لەم رووداوە پتریش جوان و خۆشەویستتر ببوو. سەراپای بوونی ئەو ئومێد و گفتدان و خۆشبەختی بوو. سولّتان مراد لە چرکەیەکدا لە تێکڕای ئەم خالاّنە گەیشت و هەستی پێکرد. سولّتان مراد بەدەنگێکی لەرزۆکەوە پیّ ی گوت :

- من وامدەزانی، کە تۆ نەخۆش کەوتبی.

میرزاگولّ وەلاّمێکی ئەم قسەی سولّتان مرادی نەداوە و بەستەییێکی دەرهێناو دایە دەستی سولّتان مراد و گوتی :

- بگرە ئەمە بۆ تۆیە. . بەبێ ئەوەی خۆی بووەخرێنێ ملی رێگای خۆی گرتەوەبەر.

سولّتان مراد دوایی زۆر جاری دیکەشی تەماشای ئەو دەسماڵە ئاوریشمیە گولّچنەی کردەوە. لەباخەلّی خۆی دەریدەهێنا و سەر لەنوێ دەیشاردەوە و دیسانەوە دەستی تێوەردەدا و تەماشای دەکردەوە. دەسماڵەکە هێندەی لاپەڕە کاغەزێك بوو و لە چواردەورەکەی بە داوێکی رۆشن نەخش و نیگار و گولّ و پنچکی لێ نەخشێنرابوو و لە گۆشەیەکیدا بە داوێکی سوور دوو پیتی گەورە و یەك پیتی بچووك لە نێوان نەخش و نیگارەکاندا بەرچاو دەکەوت:

(س و م) کەمانای (سوڵتان مــراد و میرزاگــوڵ) بــوون. ئــەم پیتانــە، بــەر لــە چـاککردن و ڕاستکردنەوەی ئەلف و بێ‌ی گرگیزی، لەقوتابخانە فێرببوون و وەلاّمــی نامــە دورودرێژەکــەی ئەوبوو. سوڵتان مراد لەحاڵێکدا بە سەختی خۆشی سەر کەوتنەکەی خۆی دەشاردەوە و بەرەو تەویلە دەگەڕاوە. دەیزانی، کە ئەمە خۆشیەکی ئەو هایە، کە بە هیچ کەسێك نـاکرێ لـەناوی ببا و خۆشیەکی تایبەت بەخۆیەتی و هیچ کەسێکی دیکە ناتوانێ وەك ئـەو خۆشـبەخت بـێ. لەگەل ئەوەشدا دڵی لەخۆشیا دەفڕی بۆ ئەوەی باسی چاوپێکەوتنەکەی ئەمڕۆ بۆ برادەرەکـانی دەستەکەی بگێڕێتەوە و دەسماڵەکەی بەدیاری درابوویەی پێیان پێشان بدا.

دەست و دڵی باش لەکاردا بوون. کوریژگەکان دوای ئـاودانی ئەسـپەکانیان بـاش پاکیـان دەکردنەوە و بەسەتل جۆیان دەبرد و کایان لەناو ئاخوڕەکان روو دەکرد. سوڵتان مراد یەکسەر کەوتە کار و بەخێرایی پشت و لاپاڵوە لوس و بەهێزەکانی ئەسپەکانی خۆی ڕنی و چوو، جۆیان بۆ بێنێ و بەردەوام لەباخەڵی سەر سینگی بلوزە سەربازیەکەی، کە پڕ بە لـەش و لاری خـۆی دووریبـۆوە. هەسـتی بـە دەسـتماڵەکە دەکـرد. وەك ئـەوەی ئاگرۆکەیـەکی نادیـار لەوێـدا هەڵگرابێتەوە وابوو. لەم بابەتەوە شادی و نیگەرانییەك بەسەریدا زاڵ بوو. زۆر دڵشـاد بـوو بەوەی، کە میرزاگوڵ دڵی داوەتێ و ئەوی خۆشویستوە. نیگەرانییەکەیشی لەوە بوو، کە ئەمە سەرەتای ڕووداوێکی نادیار بوو. سوڵتان مراد لەدواییدا بۆ کاهێنان چووە پشـت تەویلەکـە. ئەوێ بێدەنگ و بەر رۆژ بوو و بۆنی تیژی پووش و پەلاّش دەهات. زۆری حەز کـرد جـارێکی دیکەش تەماشایەکی دەسماڵەکە بکاتەوە. بۆیە لەباخەلی خۆی دەرهێنا و لـەنێوان بۆنـەکانی پووش و پەلاّشاندا هەستی بە بۆنی تایبەتی دەسماڵەکە دەکرد، وەك ئەوە بـوو بـۆنی سـابونی بۆنداری لێبێ. ئێستا بەبیری هاتەوە، کـە ئـەم بۆنـە هـەمان ئـەو بۆنەیـە، کـە جارێکیـان لەقوتابخانە لەکەزییەکانی دەهات و. کەوتە تەماشاکردنی دەسماڵەکە. ئەو بەم شێوە بەتـەنیا لەگەڵ دەسماڵەکە وەستابوو، کە لەپڕ کەسێك دەسماڵەکەی لەدەست ڕفاند. سەری سـووراند — دیتی ئاناتای بوو.

- ها، تۆ ئێستا دەسماڵی لێوەردەگری !

سوڵتان مراد سوور سوور هەڵگەڕا :

- بیدەوە خۆم !

- سەبر بگرە، یەکەمجار دەبێ تەماشای بکەم.

- من پێتدەڵێم بمدەوە !

- بەسە، هاوار مەکە، دەتدەمەوە. وادەزانی زۆرم پێویستە.

- بینە خێرا دەی !

- یەك بەدەنگی خۆت بقیژێنە. هاوارکە، کە دەسماڵە دیاریەکەی تۆیان رفاندوە... و لەباخەڵی خۆی نا.

سوڵتان مراد ئیدی نەیزانی، کە لەدوای ئەوە چی رویدا تەنیا بە دەم و چاوی پڕ لەترس وتورەیی ئاناتای بە خوارو خێچی هاتە بەرچاوان. ئەو بەهەموو هێز و توانایەکی، کە تێیدابوو زەبرێکی دیکەی لەئاناتای وەشاند، بەڵام لەو زەبرەی، کە بەرسکی کەوت پەڕیە ئەولاوە. ئەو یەکسەر هەڵساوە و بە تووڕەیی و نەفرەتێکی زۆرترەوە ورژمی بۆ سەر ئاناتای هیچ وپوچ و ناپیاو کرد. منداڵەکان رایان کرد و بەسەر راگەیشتن و بەسەر لێشێواوی هەرسێکیان هەوڵیاندا، کە لێکیان جیاکەنەوە. تکایان دەکرد و دەپاڕانەوە و بەدەستەکانیاندا ئاوێزان دەبوون، بەڵام سودی نەبوو دیسانەوە هەڵمەتیان بۆ یەکدی دەهێناو بێبەزەییانە تێکیان هەڵدەدا. سوڵتان مراد تەنیا وشەیێکی دووبارە دەکردەوە : (بمدەوە)، (بمدەوە) و هەر ئەوەندەی دەزانی، کە تەنیا رێگاییێکی لەبەرە، یان مردن، یان وەرگرتنەوەی دەسماڵەکە. ئاناتای چوارشانە و بەهێز بوو بەخوێنساردی کاریدەکرد، بەڵام سوڵتان مراد حەقی بوو، راستیشی دەکرد و بێ پەروا هەڵمەتی دەهێنا، هەر چەندە زۆربەی جاران دەکەوت. جاری دوایی کەوتە سەر شەنەیەك، کە لەنزیك کۆمەڵەکایەك لەسەر زەوی دانرابوو. خۆی لەخۆیدا هاتە ناودەستی و بە شەنەوە فرتکێکی بۆ ئەوێ لێدا. منداڵەکان هاواریان لێهەڵسا و بەرەو ئەوێ رایان کرد.

- بوەستە !

- بوەستە !

- چی دەکەی !

ئاناتای، کە زۆر هەناسە بڕکی بوو دەست و قاچی لێك کردەوە و تەماشای هەموولاییێکی دەکرد، کە بۆکێ و چۆن ڕابکا. سوڵتان مرادی بەرانبەر بوو. بەڵام جێگاییێك نەبوو لێوەی دەربازبێ. لەلایەك کۆمەڵێ کا. لەلایەکی دیکە دیواری تەویلە. رێك و سەروەخت سوڵتان مراد باڵی گرت. ئەو دەیزانی، کە ئەم کارەی ئەو زێدە رۆییە بەڵام چاریدیکەی نەبوو.

سوڵتان مراد بە ئاناتای گوت:

- بمدەوە ئەگینا رۆژە رەش بەچاوی خۆت دەبینی.

ئاناتای بەپەلە وەك بلێ ی هەولێدەدا، کە هەموی بەگاڵتە وەرگرێ گوتی:

- باشە بگـرە، وەرە وەریگـرەوە... . . ، گاڵتــە نـازانی! هــەی گــەلحۆ: و دەسماڵەکــەی بەرەولای سولڵتان مراد تورهەڵدا. سولڵتان مراد هەڵیگرتــەوە و لەبــەر باخــەڵی نـاوە. چــەند دەقەییێکی زۆر ترسناکی بەسەردا تێپەڕی. منداڵەکان هەناسەییێکی خۆشیان هەڵکێشا. بــەزم ودەنگە دەنگیان ناوە و سولڵتان مراد تەنیا ئەو کاتە هەسـتیکرد، کــە چــۆن گێــژو وڕ بــووە و سەری دەسوورێ و دەست و قاچەکانی دەلەرزین و بەدەم تفاندنەوەی خوێنی لێوی وەك مەستان چووە پشت کۆمەڵە کایەکە و لێ ی پەپشتا کەوت و هەناسەییێکی دا و بەخۆهاتەوە... .

٨- سولڵتان مراد و ئاناتای هەرچــەندە لەگــەڵ یەکـدا ئاشـت نەبوونــەوە ، بــەڵام کــاری هاوبەش ئەوانی ناچار کرد، کە بەرەبەری ئێوارە لەگەڵ یەك بسـازێنەوە و لەهــەمان کاتیشــدا لەوکارانەی کەبەرانبەری یەکـدی کردیـان دڵیـان لێـك شـکابوو، ئــەوان کــاری ئەحمــە قانــەو شەرماویان لەگەڵ یەکـدا کـرد بــوو. بــەڵام لەگــەڵ ئەمەشــدا ســولڵتان مــراد دەیزانــی، کــە ئەزموونێکی گرنگی وەرگرت و ئەگەر ترسنۆکی نیشان دابا و سەری خــۆی کزکردبــا بــەر لــە هەموکەسێك خۆی بەسوکی دەهاتە بەرچاو. کەسێکی ئەوهاش نەیدەتوانی و نەشدەبوو ببێتــە فەرماندەی دەستەکە. سولڵتان مراد لەهەمان رۆژی، کە دوای نیوەڕۆکەی تینعەلیۆف سەرۆکی کۆڵخۆز و چکیشی سەردەستەکە هاتنە حەوشەی تەویلەکە باوەری بەم شتە هێنا. ئەسپەکانیان ماندو مردو لەرێگاییێکی دور هاتبوونەوە. تینعەلیۆف و چکیشی بــە سالاچــوو لەبەیانییــەوە چوبوونە سەر زەویەکانی ئەکسای و تازە گەڕابوونــەوە. دەشــت و دەرو بیابــانی چــۆل و ســارد هەناسەیەکیان دابوو. زەوی گونجــا و لــەبار زۆربــوو. هەرچــەندەی بتــوانرێ بکێڵــرێ دەتــوانن بیکێڵن. ئەوان شوێنی نیشتەجێ بوون و چادر هەڵدانیان هەڵبژاردبوو. تەنیا هەر ئەوە مــابوو، کە ئەوکارەی بەدرێژایی زستان ئامادەیان کردبوو بۆ جووت وکێلاَن، ئێستا بچن لەوێ جــێگیر بن و دەست بەکارەکانیان بکەن.

- باشە، کوڕینە حاڵ و بارەکە لەچــیدایە؟ ســەرودڵیان چــۆنە؟ پێشــنیازێ، رەخنەیــەکتان هەیە؟ هەرچی هەیە بیلێن تا لە پاشدا، کە لەئائیل دوور دەکەونەوە کەم و کووڕیتان نەبێ.

منداڵەکان بێدەنگ بوون و وەك ئەوەی بابەتێکی کە پێویستی بەچارەسەریەکی خێــرا بکــا لە ئارادانەبوو و هیچ کەسێك متەقێکی لەبەرەوە نەهاتە دەرێ.

ئەرگش گوتی:

- ئێمە فەرماندەمان هەیە، ئەو لەهەموشتێك ئاگادارە. باخۆی قسەبکا.

ئەوکاتە سوڵتان مراد گوتی، ئێستا هیچ کەم وکوڕی و پێداویستییەکمان نییە. خەمی هەموشتێك خوراوە. کەوشەکان چاك کراونەتەوە. جلوبەرگەکان پینەکراون. بۆ خۆداپۆشین کەوڵ لەبەردەکەن. بەکورتی، منداڵەکان، هەوجاڕ وئەسپەکانیان ئامادەن تا هەر رۆژێك هەر لەگەڵ ئەوەی زەوی نەختێ کزر بێتەوە، دەکەونە کار. دوایی لە زۆر بابەتی جیاجیای دیکەیان وەك چێشتلێنەر، ئاگر و سووتەمەنی و چادریان کۆلێەوە و گەیشتنە ئەو ڕایە هاوبەشە کە پاشی دووسێ رۆژی دیکە ئەگەر هەواکەی نەگۆڕێ و بەفر نەبارێ، ئەوا وەختی ئەوەیە بەرەو کێڵگە بەرێکەوین. هەرچەندە هەور لەئاسمانداوو بەڵام ناخۆش نەبوو و لەئاسماندا شینایيەکی زۆری خاڵی لەهەور هەبوو. خۆر ناوناوە سەرەتاتکەی دەکردو ون دەبۆوە. زەوی بەفری لێ چوبۆوە هەڵمی دەکرد و بۆنی شێی دەدا. رۆژانی کار لەئەکسای نزیك دەبۆوە و هەموو کارەکانیش بۆ ئەو رۆژانە ئەنجام گیر دەبوون.

ئەوان بەهەموو شێوەییێك ئامادە ببوون بەڵام ڕێك بەر لەوەی بەرەو ئەکسای بچن یەك کۆمەڵ وردەکاری سەریان هەڵدا. بەدەرکەوت، کە دوو جلەکورتانیان کەمەو ئەو جلانەی کە هەیانبوو بەتەواوی کۆن وکون کون ببوون و بردنیان بۆ ئەکسای بێ مانابوو. شەوانی سەرەتای بەهار وەبگرە سارد و زستانین. بەتایبەتی لەرۆژانی یەکەمی کێلاّن، چکیش دەیگوت، کە سەردەمی زو کاتێك بە گاسنی دار زەویان دەکێلاّ، رۆژانی یەکەم وا دەهاتە پێشەوە، تائێوارە چاوەڕێ دەبوون کەزوقمی شەو زەوی بەربدا... ئەو دەیگوت گەر ئەسپێك بە درێژایی شەوەکە لە بێ جلی هەڵ لەرزێ بەدەردی هەوجاڕ راکێشان نایە. سوڵتان مراد ناچار بوو جارێك بۆ بەڕێوەبەرێتی کۆڵخۆز و جارێك بچێتە لای سەرۆکی کۆڵخۆز و جارێکی دیکە بۆ لای سەردەستە ڕابکا. تا توانیان لە ئائیل دوو جلی باشی دیکە بۆ کۆڵخۆز بکڕن.

لەم ڕاکەڕاکەو کارانە ئەو پتر لە هەرشتێکی دیکە چاوەڕێ ی کاتی رۆیشتنی سوارەکان بوو بۆ سەر ئاو وئاودانی ئەسپەکان. حەزیدەکرد وەك ئەو جارەی دیکە بەر لە رۆیشتنیان لەرۆخ بەردەبازەکەی سەر رووبار چاوی بەمیرزاگوڵ بکەوێ. سوڵتان مراد پەلەی دەکرد. ماوەی چاوەڕانی نەبوو. لەبەر ئەوەی ئەو هەمیشە هەستی بە کەم و کوڕی لە قەرارو مەدارێکی نێوان خۆی ومیرزاگوڵ دەکرد و لەمەڕ ئەو قسەوگفت بەیەکدانانەی نێوانیشیان، کە بە تەواوی قسەی لەبارەوە نەکرابوو و روونەکرابۆوە، لەخۆیدا هەستی بە گوناح دەکرد بەتایبەتی، کە رەنگ بوو بەر لە رۆیشتنیان یەکدی نەبینن. ئەو دەیزانی میرزاگوڵیش بیر لەو دەکاتەوە. لەگەل ئەم بابەتە ئەو جارە لەگەڵ تەماشای یەکەمی میرزاگوڵ، کە دەتگوت خۆی تێداناسی باوەڕی

پەیداکرد. بەڵام سوڵتان مراد هەربیریشی لێنەکردەوە کە میرزاگوڵ خۆی لەدوای ئەو و پەیوەندی ئەو دابێ. غرورو ئابڕوی کچانە ڕێگای ئەم کارە نادا. خانمۆڵەکە تازە قسەی خۆی کردوە و دەسماڵی گوڵچنی بە ئەو داوە. ئەو یدیکەی ماوەتەوە کاری پیاوانە و پەیوەندی بەوەوە هەیە...

هەڵبەتە ئەو دەیتوانی بەر لەڕۆیشتنی پەیوەندی بەمیرزاگوڵەوە بکا. ئەو هەر وایدانابوو ئەگەر بەدبەختیەکی دیکە روونەدا. رۆژی بەر لەچونیان بۆ ئەکسای کاتێك، کە ئەندامانی دەستەکە ئامادە دەبوون تا ئەسپەکانیان بۆ دوا ئاودان، ئاو خواردنەوەی ماڵئاوایی لێخورن، یەعنی هەمان ئەو کارەی، کە دوای ئەوە سوڵتان مراد دەیویست چاوەڕێ ی میرزاگوڵ بکا، لەبەر گەورە دەرگای ئاخوڕو تەویڵەدا کاتی رۆیشتنی سوارەکان بۆ سەر ڕوبار، چکیشی سەردەستە توشیان هات. ئەو گرژ بوو و گرتبوی. ریشی چکۆڵەی خەنەیی پەرش و کلاَوی تا سەر برۆیەکانی هێنابوو.

- بۆ کوێ دەچن؟

- دەچین تا ئەسپەکان ئاوبدەین.

- بوەستن. ئاناتای تۆ بڕۆوە ماڵ، دایکت نەخۆش کەوتووە. برۆ، هەر ئێستا لەئەسپەکە دابەزە. کوڕینە ئێوە برۆن ئەسپەکانتان زوتر ببەن ئاویان بدەن و وەگەرێن. من لێرە چاوم لەرێتانە.

سوڵتان مراد لەرێگای بەرەو سەر ئاوەکە ئەسپەکانی بە چوار ناڵە وەپێش خۆیدا تەماشای دەکرد و کاتی گەڕانەوەش هەر چاوی دەگێڕا و تاببینێ میرزاگوڵ دیارە یان نا. هێشتا کاتی هاتنەوەی نەبوو. بۆ چی چەکیشی پیر ئەوانی بەپەلە پەل خست؟ چی رووی داوە؟ ئەگەر ئەم پەلەکردنە نەبایە ئەوا بێگومان ئەمرۆ چاوەڕێ ی دەکرد. چەندە تامەزرۆ بوو لە بەردەبازەکە بەدیداری شادبێ...

هەرکە ئەوان گەڕانەوە حەوشەی تەویلەکە و ئەسپەکانیان لەسەر جێگاکانیان بەستەوە، چەکیشی پیرەمێرد کۆیکردنەوەو و بانگی کرد و لە ژێر لێوەوە گوتی:

- قسەم هەیە:- لەدوایی بە منداڵەکانی گوت. . دانیشن.

هەمویان لەسەر چنچکان دانیشتن و پشتیان بە دیواردا. تینعەلیۆف حەزی دەکرد بەپێوە قسە بکا. خۆی رادەوەستا و دەیویست، کە خەڵکیش لەبەردەمی ئەودا راوەستن. بەڵام سەردەستە چەکیش بە پێچەوانەوە، ئەو لای باشتربوو بەبێ پەلەکردن و بەدانیشتنەوە قسە

بکا. پیرەمێرد ئەوهایە. کاتێك منداڵەکان دانیشتن چکیش بەقیافەتێکی غەمبار دەستی بە ریشە خەنەییە ئاڵۆزکاوەکەی داهێنا و دەستی پێکرد:

-من دەمەوێ پێتان بڵێم، کە ئێوە چیدی منداڵی بچوك نین. بۆ ئێوە زوو ئەوە هاتۆتە پێشەوە تاڵی ژیان بچێژن و لەسەر زەوی داغ هەنگاوبنێن و لەباوەشی سەرمادا بخەون. چارەنووستان ئەمە بووە. ئیمرۆ بەدبەختیەکی گەورە دامەنگیری یەکێکتان بووە. ستار قول بابی ئاناتای لەبەرەکانی جەنگ کوژراوە. ئێستا ئێوە منداڵ نین. کاتێك یەکێك بەدبەختیەکی لێ روودەدا ئەوانی دیکە دەبێ پاڵپشتی ئەو بن. ئامادە بن. دەبێ پێشوازی لەخەڵکی بکەن و خەڵکی بەڕێ کەن. دەبێ ئاگاتان لە ئەسپی خەڵکی بێ. ئێستا خەڵك لەبەردەم ماڵی ستار قولی خوالێخۆشبوو کۆ دەبنەوە و ئێوەش دەبێ لەوێ بن. وەك منداڵی ساوا لەتەنیشت ئاناتای نەگرین. بەڵام ئەگەر گریان بەدەنگی بەرزو، پیاوانە بگریەن، بۆ ئەوەی هەمووکەسێك ببینێ، کە دۆستە وەفادارەکانی ئاناتای دەگریەن. لە گەڵم وەرن. هەر لەبەر ئەمەبوو من پەلەم لێکردن... .

ئەوان بەیەك ریزی لەدوای یەکدا لەباریکە رێگایەکەوە بەرەو ماڵی ئاناتای، کە لەکۆتایی شەقامەکەبوو، دەرۆیشتن. خەڵکیش دەستە دەستە بێدەنگ، سوارەو پیادە لەهەر لایەکەوە رولەوێدەکەن. هەوا لەگۆڕاندابوو. جارێك هەتاو بوو دەمێك هەور، دەمێك بای باکور هەڵیدەکرد و دەمێك با لەسەر زەوی لە دامەنێوە بەهەموو ساردی خۆیەوە لەقولە پێیەکانی دەدان. سوڵتان مراد بەدڵێکی توند لە ترس و دڵ پێ سوتان ئازاری دەبینی بەرەو ماڵی ئاناتای رێ ی دەکرد. ترسناك بوو لەبەرئەوەی دوای یەك دەقە لە ئائیل شین و گریانێکی زۆر وەك گڕو کڵپەی ئاگر لەسەربانەکانەوە هەڵدەستێ و دیسان کەسێکی دیکە، کە لەدامێنی ئەم چیایانەی ئەژداد و ئابادی لەدایك بوە و گەورە بووە، نابیننەوە، ئەو لەجەنگ ناگەڕێتەوە و هیچ جارێکی دیکە و هیچ کەسێك ئەو نابینێتەوە... . (چی بەسەر باوکم دا هاتوە، تا ئەم کاتەش نە نامەیەك نە دەنگ و باسێکی ئەو نییە؟ چی بەسەر هاتوە؟ دایکم لەترسان عەقلی لەدەست داوە. تەنیا ئەمە روونەدا. تەنیا ئەوهامان بەسەر نەیە. ).

ئەوان لەحەوشەکە نزیك ببوونەوە، لە ماڵی ئاناتای دەنگی شیوەنێکی بەسۆز و دڵ توندکەر دەنگی داوە. دەنگی ئەم گریانە لەحاڵێکدا زۆرتر دەبوو و، سەر شەقامەکەشی، کە خەڵکی تێدا کۆببۆوە، داگرت. ئەندامانی دەستە هەر بەو نەزمەی، کە بەدوای چکیش

دارێیاندەکرد بەدەنگی بەرز لە پڕمەی گریانیان دا و پێکەوە دەستیان بەگریان کرد و ئەمە ئەو شێوە بوو، کە چکیش پێی گوتبوون.

- ئای ستار قوول باوکی پاڵەوانمان، باوکە باشەکەمان ستار قول، ئیدی لەکوێ جارێکی دیکە دەتبینینەوە، تۆ سەری بەرزت لەکوێ دانا؟

لەم دەقەدا، لەدەقەی خەمی گشتی، ستار قول باوکی ئاناتای بەراستی باوکی خۆیان بوو. لەو دەقەدا بەراستی چاك بوو، چونکە گەورەیی هەرکەسێك تەنیا کاتێك لەلای نزیك و برادەرەکانییەوە دەرکی پێدەکرێ، کە ئەویان لەدەست دەچێ... . هەر ئەوهاش بووە و ئەوهاش دەبێ.

- ئای باوکی هەمومان ستارقول، باوکە باشەکەمان ستار قول، ئیدی لەکوێت دەبینینەوە؟ لەکوێ سەری زێڕینت نایەوە؟ .

کەسانی دەستەکە بەم گریان و نوکە نوکە بەدوای چکیش دا بەناو ئاپۆراکەی خەڵکدا تێپەڕین و کاتێك، کە چونە ناو حەوشەکەوە ئاناتایان لەبەر دەرگادا دیت. خەم مرۆڤ بچووك دەکاتەوە. بە بەتەمەنترین و زەبەلاح ترینیان هەر هێندەی منداڵێکی لێهاتبۆوە. شانەکانی لەژێر باری غەمدا داهاتبوو و فلیچابۆوە لەشێوەی جوانوە ئەسپێك لە هەوای نالەبار و ناخۆش دابێ خۆی چەسپاندبووە پاڵ دیوار، وەك منداڵان گریان و نالینیانبوو، لەهەژمەتی گریان دەم و چاوی هەڵزەپەتابوو و هەروەها برا و خوشکە بچوکەکانیشی لە رۆخ ئەودا بەدەنگی بڵندەوە دەگریان. دۆستان چونە کن ئاناتای. هەرکە ئاناتای ئەوانی دیت زیاتر لەکوڕژنی گریانیدا. وەك ئەوەی دەیویست لەو کۆست و بەختڕەشیەی رویداوە گلەییان لێبکا. ئەو بەم هۆیەوە داوای لێکردن، کە داکۆکی لێبکەن و یارمەتی بدەن. ئەم لاوازیەی ئاناتای بەر لەهەموان سوڵتان مرادی هێنایە لەرزە. بەڵام دۆستانی ئەو لەرۆخ وکەناری سەراسیمە دەهاتن و دەچون و نەیاندەزانی چی بکەن و چۆن دڵنەوایی هاوڕێ کەیان بکەن. هیچ کەسێك نەیدەتوانی کۆمەکی ئەو بکا و بەمێشکی کەسدانەهات، کە سوڵتان مراد چۆن (بەتفەنگەکەی لەحەوشە چوە دەرێ و لەگەڵ ئەودا یەکسەر، بەرەو ئەو جێیەی، کە جەنگی لێیە، بۆ بەرە، یەك بین رای کرد و لەوێ بەگریان و دادوفیفان و هاواری پڕ لە رق و تووڕەییەوە بەتەقاندنی ریزێك گوللە دەستڕێژێکی دورو درێژ تەق تەق تەق تەق لە خوێنخوایانی باوك کوشتەی دۆستی خۆی ئاناتای بۆ تۆڵەکردنەوە و ئەو بەدبەختیانەی دامەنگیری ئائیل بووە دەستی بە تەقەکردن کرد.

چەند مەخابنە، کە ئەو تفەنگی نەبوو!

سولّتان مراد بە ئاناتای گوت(ئاخر ئەو- فەرماندەی دەستەیە):- ئاناتای مەگری، چیمان پێدەکرێ. باوکی(ئارکین بەگ و قوباد قول)یش لەبەرەی جەنگدا کوژراون. خۆت دەزانی، کە باوکی منیش دەمێکی زۆرە نامەی نییە. جەنگە. ئەمە یان خۆت باش دەزانی. ئاناتای، تۆ تەنیا بلێ چی بکەین تا تۆ ئارام بیتەوە. تۆ تەنیا بیلێ تا ئێمە یارمەتیت دەین... .

بەلاّم ئاناتای، کە پالّی بەدیوارەکە دابوو و بەشێوەییێکی پڕ لەگرژی شانەکانی تەکان دەداو نەیدەتوانی قسەیەك بکا. ئەم قسانە ئەوی هێمن نەکردەوە و بە پێچەوانەوە حالّ و باری خراپتر کرد و لەتاو گریان تەنگە نەفەس بوو لە تاو گیرانی هەناسەی شین و مۆر هەلّگەڕا. سولّتان مراد رایکرد و قۆقیلە ئاوێکی بۆ هێنا. ئەو لەم چرکەدا خۆی لەبەرانبەری ئەو شتەی، کە رویدابوو بە بەرپرسیار هەست پێدەکرد. ئەو زانی کە دەبێ بجوولّێ وکاربکا و کۆمەکی خەلّکی بکەن. ئەوان چوارکەس لەسەر رووبار ئاویان دەکێشا، داروچیلکەیان دەشکاند، ئەو سەماوەرانەی لە هاوسێکانیان خواستبۆوە هەلّ دەکرد. پێشوازی خەلّکیان دەکرد و خەلّکیان بەڕێ دەکرد، یارمەتی پیرەمێردانیان دەدا تا لەئەسپەکانیان دابەزن. خەلّکی هەر دەهاتن و هەر دەهاتن. ئەوان دەهاتن سەرەخۆشی لەبنەمالّەی خوالێخۆشبوو بکەن. هەندێك، کە ئەرکی خۆیان بەجێ هێنابوو دەڕۆیشتن. بەلاّم ئەندامانی دەستە سەرتاسەری رۆژەکە لەمالّی ئاناتای مانەوە. سولّتان مراد ئەو کاتە سەخترین چرکە ساتەکانی ژیانی بەسەر برد، کە خانمی مامۆستا ئینکەمال ئاپای لەگەلّ کچەکانی پۆلی حەوت و، کە میرزاگولێشیان لەگەلّدابوو، هاتنە ئەوێ. ئینکەمال ئاپای ئەوها دەگریا و، ئاناتای لەباوەش گرتبوو دەگریا و بێ تاقەت بوو، کە نەدەکرا تەماشای بکەی و فرمێسکت لەچاوان نەیەتە خوارێ، پێشبینی ئەو فالّگرەوە بەناوبانگە لە بارەی کوڕی خانمی مامۆستاوە تەواو دەرناچێ. ئەو خۆیشی باوەڕی بەقسەکانی فالّگرەوەکە نەبوو. ئێستا ئەو بەنیگەرانییەکەوە، کە دلّی خەبەری دابوو، دەگریا و فرمێسکەکانی بەرەلاّ کردبوو تا دلّی غەمباری هێور کەنەوە. کچۆلەکانیش لە دەور و رۆخی مامۆستاکەیاندا دەگریان. میرزاگولّ سەری لەبەر خۆی نابوو، راوەستابوو بەکپی دەگریا. رەنگ بوو باوك و براکەشی هەر لەبەر ئەو هاتبوون. ئەو بۆ جارێکیش ئاوڕێکی لە سولّتان مراد نەداوە. میرزاگولّ لەگەلّ ئەو هەموو غەم و پەژارەشدا لەهەموان جوانتر بوو. سولّتان مراد حەزی کرد بچێتە تەکی، لەباوەشی بگرێ و بگری و خەمی دلّی خۆی لەگەلّ هی ئەودا تێکەلّ بکا و بیکاتە یەك.

ئا، میرزاگولّ، میرزاگولّ- بکیچ،

من کۆترێکی کێویم، لە ئاسمانی شیندا دەفڕم
تۆ کۆترە ماشوقەکەمی و باڵ بەباڵی من لە شەقەی باڵت دێ

لەدواییدا هەرکە لە حەوشە دەنگی دوعا خوێندن بەرز بۆوە و هەموو ئامادەبووان بێدەنگ بوون، هەر کەسە بە پانکردنەوەی لەپی دەستی و ڕاگرتنی بە بەر دەم و چاوی و تەماشاکردنی ناو لەپەکان وەك تەماشاکردنی کتێبی چارەنووس و ژیان. هەرکەسێك خۆی لەگەڵ خۆیدا تەنیا ماوە و کاتێك، کە دوعایەکی خۆش ئاواز و پڕ شکۆی گوێ لێبوو کەوا پێش هەزار ساڵ لەئێستا لە عارەبستانەوە گەیشتۆتە ئێرە و هەتاهەتایی بوونی دنیا لەشێوەی مەرگ و لەدایك بووندا خستۆتە ڕوو، و ئەمجارە بۆ ستار قول باوکی ئاناتای، کە لەبەرەی جەنگدا کوژاوە، ئەم دوعایە بەتایبەتی خوێندراوە، هەتا لەکاتێکی ئەوهاشدا، سوڵتان مراد لەناوەڕاستی خوێندنی ئەو دوعایە، چاوەکانی بەرز کردەوە و لەسەر دەستەکانییەوە کە بۆ دوعا خوێندن بەرزیکردبۆوە تەماشاییێکی میرزاگوڵی کرد و دیتی میرزاگوڵ زۆر ڕێك و بەهەستێکی بەرز و جوانەوە لەناو ئاپۆراکەدا وەستاوە. لە دەم و چاویدا دەدیترا، کە بەقووڵی لە بیرکردنەوەدا ڕۆچوبوو. بەڵام میرزاگوڵ سەیری ئەوی نەدەکرد. ئەو ڕۆیشت و یەك قسەشی لەگەڵ سوڵتان مراددا نەکرد و تەنیا کاتی ڕۆیشتن نیگا خەمبارەکەی کەمێك لەو کرد و سەری بۆ خوارەوە برد. ئاخ، میرزاگوڵ، ئاخ میرزاگوڵ بیکچ... .

گریان لەماڵی ستار قولی خوالێخۆشبوو کەمێك کپ بۆوە و بەمجۆرە بێدەنگیەکی هوشیار و دڵتوندیەکی سازگار بۆ ئەوەی، کە لەدەست چوبوو، هەستیپێدەکرا. گریان- نارەزایی و سەرپێچی و نەسازانە، بیرو خەیاڵی لە گەڕانەوە نەهاتوی ئەوەی، کە ڕووی داوە لە گریان ترسناکترە، لەهەمان کاتدایە کە خەمبارترین و ناشیرینترین بیر بە مێشکی مرۆڤدا دێ. ئاناتای لەبن دیوارەکە دانیشتبوو و سەری لە بەر خۆی نابوو. تەماشاکردنی ئاناتای بۆ سوڵتان مراد کارێکی ترسناك بوو. بەدبەختی ئاناتای دەم درێژ، بەهێز و تووڕە و شەڕانی ماڵی کاولکردبوو. باشتر بوو داد و فەریاد و هاواری کردبا و بگریابا. باشتر بوو بەرۆکی خۆی دادڕیباو خۆی لە خاك و خۆڵدا گەوزاندبا. سوڵتان مراد نەیدەزانی چۆن ئەو لەو تەنیاییە پڕ لە خەم و لە توانا بەدەرە بێنێتەدەر. بەڵام پێویست بوو یارمەتی بدرێ، دەبووایە بە هەر بارێکیا ئەو ناچار بکرێ هەست بکا، کە ئەو تەنها نییە و کەسانێکی لە دەور و بەردان، کە ئامادەن لە بۆ ئەو دەست لەگیانی خۆیان بەردەن.

سوڵتان مراد پێی گوت:

- ئاناتای، برۆ بابرۆین، قسەیەکم هەیە دەمەوێ بەتەنیا لەگەڵتدا بکەم.

ئاناتای لەجێگای خۆی هەڵسا و ئەوان پێکەوە بۆ پشت دیوارەکە چون. سوڵتان مـراد لـە حاڵێکدا دڵی زۆر لەکەف و کوڵدا بوو و بەزەحمەت وشەی لە دەم دەهاتەدەر وگوتی:

-ئاناتای، تۆ بیرمەکەوە، من ئەو... . ئەگەر دەتەوێ مـن ئـەو دەسماڵـە بـۆ هەمیشـە دەدەمە تۆ.

ئاناتای بە غەمگینییەوە زەردەخەنەیەکی هاتێ و گوتی:

-ئەوە تۆ چ دەڵێ ی، سوڵتان، نا... پێویستم نییە. دەسماڵ دەسماڵی خۆتـە، مەیـدە هـیچ کەسێك. من... . تۆ من ببەخشە. من ئیدی، سوڵتان، هیچ کاتێکی دیکـە کـاری واناکـەم. ئێستا من هیچ شتێکم پێویست نییە... . باوکی ... من، ئەو... . ئێمە چەندە چاومان لە رێ ی ئەو بوو... . گریان قورگی ئاناتای گرتن و فرمێسـکی هاتنـە خـوارێ و سـەر لـەنوێ دەستی بە گریان و زاری کردەوە. ئێستا ئەوان پێکەوە لەگەڵ بارو زەمانەکە لەو ژیانەدا گەورە دەبوون. سەریان لەگریان نا... .

٩- سێیەمین رۆژ بوو، کە لەسەر زەمینی ئەکسای گاسنەکان ورگـی زەویـان هەڵـدەدڕی. سێیەمین رۆژ بوو، کە جوتێران بەبێ وەستان لە ئەسپەکانیان رادەخـوڕی و لەیەکـەمین پارچـە زەوی، کە بەدەستی جوتێران دەکێڵدرا خەتی تاریك و شەپۆلاوی کێلاّنی تازە بەدیار دەکەوت.

ئەو کارەی کردبوویان هەستی پێدەکرا و هەر حەزت دەکرد تێی برۆنی چـێژت لـەبینینیان وەردەگرت. ئێستا باری ئاو و هەوا چۆنێکی بێ کارەکە ئەوها ئەنجام دەدرێ.

لەم دنیا پرشکۆیەی دامێنی چیایان لە پای زنجیرە چیای گەورەی ماناسدا بێدەنگی بە وەك خۆی مابۆوە کە دەمێکی دوورو درێژ هیچ کەسـێك نەیشـلەقاندبوو. بیابـانی ئەکسـای، کـە لەگەڵ خاکە بێ ئاوەکانی چەمکەندو تاشکەند درێژ دەبـۆوە ئـالێرەوە دەسـتی پێـدەکرد. لـەم جیهانە نەکێڵراوە، کە سـەرەتای بیابـان بـوو هـەوجارەکان وەك سیسـرکەی گـەورە دەهاتنـە بەرچاوان، کە بەدوای خۆیاندا دەخزین شونی هەڵگەندراو و نەرم و درێژیان بە جێدەهێشت. لەو شوێنە ئێستا سێ هەوجارِ کاریاندەکرد. ئەرگیش و قوباتقول بۆ چەند رۆژێك لە ئائیل مانەوە. ئەوانیان بۆ کۆمەککردنی کشت وکاڵە پایزیەکان نارد تا بـەر لـە هـەڵمکردنی شـێی ی زەوی بگرن. دیارە کە کارەکە زۆر پێویستە، بەڵام لە ئەکسایش دەرفەت سنووردارە. بۆ دەست بـە تۆکردن لەو زەویانەی لەبەر چاوگیراون، پێویستە هەموو دەستەکە لەبەیانییەوە تا رۆژ ئـاوایێ جووت بکەن، ئەگینا لێی سەرناکەون و هـەمو زەحمـەتێکیان بـە بـا دەچـێ. سـوڵتان مـراد

بەنارەحەتیەوە هەمو رۆژێك هەر چاوەڕێ ی هاتنی دوو جوتێرەکەی دیکە بوو. گفتیان دابـوو، کە ئەم یەك دوو رۆژە رەوانیان دەکەن. سولّتان مراد لەبەر وەرگرتنەوەی ئەو دوو کەسە لەگـەڵ چکیش دەنگە دەنگیان لێ پەیدابوو و بەتوندی داوای کرد و گوتی:

- بلّێن با، سەرۆکی کۆڵخۆز تینعەلیۆف بێ و روونی بکاتەوە. بە سێ هەوجاڕ کار ناکرێ. ناتوانین ئەو ئەرکەی پێم سپێردراوە ئەنجامی بدەین چکیشی پیر؟ چکیشی پیر چـی بکـا. ئـەو توکی سەری خۆی دەردێنێ و سولّتان مراد زانی، کە لەم هەل و مەرجەدا کارکردن لە کۆڵخۆز بۆ سەر دەستەیەکی هۆشمەند چەندەی گرفت بەدواوەیە. ئەو دەیویست هەموو کارەکان بەرێك و پێکی و لەوەختی خۆیدا ئەنجام بدا. لەکۆڵخۆز کارێکی زۆر بەسەر یەکدا کەڵەکە بووە، کە لـە لانی گرنگیەوە و دەم و دەست ئەنجامدانییەوە وەك کوژاندنـەوەی دەم و دەسـتی ئـاگرن، ئـەو دەیەوێ سەرکەوێ، کە لەبەهاردا ئەم کارو ئەو کار و دەکاری دیکە ئەنجام بدا، بـەلاّم هێـز و توانای بەردەستی رێیی پێنادا. کەسی لەبەردەستدا نییە، خۆراك نییە. سەری بـەرز دەکاتـەوە کلکی دێتە خوارێ، کلکی بەرز دەکاتەوە سەری دێتە خوارێ. ئەو دوێنـی لێـرە دانیشـتبوو و بیری دەکردەوە. لە ئائیل برسێتی حوکم فەرمایە. زەخیرەکان لە تەواوبونـدان و تـا بـەروبومی تازەش دێتە بەرو بەرهەم، هێشتا ماوەییەکی درێژ ماوە. ولاغەکان لەڕو لاواز بـوون لـە بێـی ئالیکیدا مردار دەبنەوە. کوشتنیشیان مانایێکی نییە. بۆ کڕینی کیلۆ گۆشتێك بـۆ نـەخۆش دەچنە بازاڕ. نرخی کیلۆ گۆشتێك بەرانبەر تەواوی لاشەییەکی سەردەمی پێش جەنگـە. بـەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەچن. بەسواریش ناچن، بەپێی پیادە سـی تـا چـل کیلـۆ مـەتر دەبـڕن. چونکە ئەسپەکانی سواری، بەزۆر لینگیان لـە دوای خۆیانـدا رادەکێشـن. ئەگـەر پیـاو بـەو ئەسپانەوە بکەوێتە رێ ئەوا رێگا ون دەکـا. تـەنیا توانیویانـە ئەسـپەکانی بـاری بـۆ کـێلاّن بپارێزن. ئەو ئەسپە باریانە هاتوونەتـەوە سـەرخۆ بـەلاّم لەگـەڵ ئـەو هـەمو فشـارەی کـار ماوەییێکی زۆر ناتوانن کار بکەن.

ئەگەر مرۆڤ لەبارەی ئەو هەموشتانەوە بیر بکاتەوە هەترەشـی دەڕژێ. بـەلاّم گـەورەترین بەدبەختی ئەو جەنگەیە لەبەرەکان، کـە کۆتاییەکـەی دیـار نییـە. ئـەنیا مایـەی تەسـکین و ئارامی، تەنیا ئومێدێکی خامۆش نەبۆوە ئەوەیە، کە سەرکەوتن بەسـەر ئەڵمانـەکان دەسـتی پێکردوە و لە هەمولاوە ئەوانیان تەنگە تاو کردوە و رایان دەماڵن...

ئیمرۆ تاقی بەیانییەکەی دەڵێ ی هەوا خۆش بووە. هەواو ئاسمان دەوری هەبوو بەلاّم سەر چیاکان ناوناوە هەتاوی هەبوو. ئاسمان بەسەر سـەرەوە، بـارێکی باشـی دەنوانـد و سـەرلەنوێ

تووڕەو گرژ دەبوو و دەگیراوە. دانی نیوەڕۆ زۆری سارد کرد و تاریکی داهێنا. بەفر یان باران دەیویست بباریێ. جوتێران دوای نانی نیوەڕۆ، کاتی دەست بە ئیش کردنەوە، لەگەڵ خۆیاندا بۆ داپۆشینی سەروگێلاکیان کیسە یان برد. ئەوان لەهەمان شوێنی گاسنکراودا یەکەمجار دەستیان بەکار دەکردەوە و خەتی جووتەکەیان بەرەو ناوەوە وەپێش دەبرد. لەبەرایی هەموان سولتان مراد، لەدوای ئەو بە دووسەد پێ ئاناتای و لەدوای ئەو لەماوەی نزیکەی نیو کیلۆ مەتر ئارکین بەگ هەنگاوی دەنا. ئیمرۆ جوتێران لەسەر زەویەکان تەنیا بوون. سێ جوتێرو کێوی گەورە لەبەرانبەر، سێ جوتێر و بیابانێکی پرشکۆ لەدواوەیان بوو. تینعەلیۆف تەنیا لەسەرەتادا توانی سەر لێرە بدا، ئەو زۆر گیری خواردوە. چکیشی سەردەستەی دانا تا باری جووتەکە رێکبخا و خۆشی ئەسپەکەی تاو داو گەڕاوە.

ئەمرۆ چکیشیش بەسواری رۆیشت تا ئەسپ و هەوجاڕی ئەرگیش و قوبادقول، کە لە ئائیل مابۆوە وەرگریێ. لەبەر ئەمە رۆژی سێیەم جوتێرەکان بەهەوجاڕ و ئەسپەکان ئەو زەویانەی، کە بۆ کێلان دیارکرابوو و دەبووایە هەر بیکێڵن و جووتی کەن، تەنیا ماونەتەوە تابتوانن بەرهەمێکی لێهەڵگرنەوە و خەڵکی پێ تێر بکەن... .

شوێنی سەر جووتەکە دوور بوو لە چادر و کاو وێنجە و کیسە جۆیەکانەوە و دوربوون لە تێکرای ئەو شتانەی، کە ئێستا ماڵی ئەوانی پێك دەهێنا. لەناو چادرەکەدا تەنیا پیرەژنێك، کە بنەوانیان بوو مابۆوە. ئەو لەباتی ئەوەی خواردن لەکاتی خۆیدا ئامادەبکا هەر پرتەو بۆڵە و سکالای دەکرد سوتەمەنی تەڕە و ئەمە نییە و ئەمە کەمە. لە سەر کێڵگە لە کوتە نانێك شۆرباوێکی گەرم بترازیێ ناکریێ داوای شتێکی دیکە بکریێ. بەڵام ئەو هەر پرتە پرتی بوو تف و نەفرەتی لە ژیان دەکرد وەك ئەوەی کەسێك لەبەر شتێك سەرکۆنە و سەرزەنشت دەکا. ئەو لە ئائیل زۆر ناسراو نەبوو. لەجێگایەکدا هاتبووە ئائیل لێی نیشتەجێ ببوو. کەسانێکی دیکە ناتوانن خان و مانیان بەرەلاکەن، بەڵام ئەو بەوە رازی بوە، کە بۆ ئەکسای بێ تا لە نزیك جوتێران سکی خۆی تێر بکا. لێبگەڕیێ بابخوا. بەدڵ وگیانی کەویێ، تەنیا خواردنەکە لەکاتی خۆیدا ئامادە بکا. بەڵام ئەو هەر بەلادادیێ و بەکارەکان ڕاناگا. جوتێران ناتوانن یارمەتی بدەن. لەبەر ئەوەی ئەسپ وەك ماشێن و تەراکتۆر نییە، کە ئەگەر ماتۆرەکەی بکوژێنییەوە و رێگای خۆت بگریە بەر و بڕۆی. یا بەنزین لەتانکی کەی و بکەویە ریێ. جووتێر لەکێلگەدا خۆیشی وەك ئەسپ کاردەکا دوای کارەکەیشی چوار ئەسپی گاسنکێش ئالیك و ئاو دەدا و سەرپەرشتیەکی باشیان دەکا و کاتێك، کە دەگاتەوە چادرەکەی لە پەل و پا دەکەویێ. هەر

لەگەڵ سەحەرێش دەبێ سەرلەنوێ دەست بەکار بکاتەوە... . لەهەموی گرفتتر لەخەو هەڵسانی کاتی سەحەرانە... . .

کاری سەرەکی جوتێر ئەمەیە، کە هەوجارِ و گاسن بێکار نەمێننەوە و ئەسپەکان کار بکەن و هێز و بونییەی خۆشیان لە دەست نەدەن تا دوادوای بەهار هێزیان لەبەر بمێنێ. ئەمە گرنگە، زۆر گرنگە رۆژی یەکەمی جووتکردن لەهەر دە بیست هەنگاوێکدا ئەسپەکانیان رادەگرت تا کەمێك هەناسەیان بێتەوە بەر. هەناسەیان دەگیرا. پێویستی دەکرد کەمێك گاسنەکە بەرزکەنەوە و قووڵی جووتەکە کەم بکەنەوە. ئەم بارە تا ئەو کاتە درێژە دەکێشێ، کە ئەسپەکان بە ئەسپابەکە ڕادێن ئەمڕۆکە کار بە تەرزێکی هەستپێکراو باشتر دەچووەپێش. ئەسپەکان هەوجارەکانیان پێکەوە رادەکێشا و پێوەی رادەهاتن. چوار تایی لەحالێکدا لەپاڵ یەکدا قەرار دەگرن و بەرەو زەوی مەیلان دەکەن و لە زۆری گوشار و ترسناکی کار گەردنیان لێك دەکێشن و وەك بورلاکان(١). لەوێنەی ناو کتێبەکانی خوێندن، رێ دەکەن. پێ بەپێ، هەنگاو بە هەنگاو هەوجارەکە، کە نوکی گاسنەکانی لە توێژێکی ئەستووری خاکدا دەباتە خوارێ، رادەکێشن و بەکێشی دەهێنن. بەلاّم هەواکە خەریکە تێك دەچێ و بۆنی بەفر دێ. پەڵە و دانەی بچوکی پروشەی بەفر بەر چاو دەکەوێ. ئەمە مانای ئەوەیە، کە هێشتا زستان خۆی کۆ نەکردۆتەوە و وای داناوە لەکاتی ماڵ ئاوایی کردندا هەندێ کەس بکوژێ. بەلاّم ئەم کارەی نابەجێ و بۆ جوتێرانیش بێجێیە. سوڵتان مراد لەگەڵ ئەوەشدا کیسەی لەسەری خۆی کرد بەلاّم کەڵکی نەگرت، چونکە ئەم کارە ئەوی لەبەفر رزگار نەکرد. ئەو لەحالێکدا سواری ئەسپی هەوجارکێش بوو ولەناوەڕاستی چوار ئەسپاندا قەراری گرتبوو داردەستەکەی بەسەر سەریدا تەکان دەدا. بەردەوام بایەکە کیسەکەی لەسەرسەری جارێك بەم لاو جارێکی دیکە بەولادا.

(بورلاکەکان): ئەو کرێکارانەن، کە بە درێژی کەناری دەریادا دەڕۆن و بە گوریسی درێژ گەشتی رادەکێشن.

دەبرد. بەفر بەشێوەییێکی چڕ. دانەی تەرەوە، زوو دەبوو بە ئاو، دەباری. دەوروبەر چەرخەلەی دەددا و جارێك دەدیترا و جارێك نادیار دەبوو. چیاکان لە ناو تەم و مژی بەفری داکردو دا بزر بوون. دنیا تاریك و سنوردار بوو تەنیا دەنگی جووتێران، کە لە ئەسپەکانیان ڕادەخوڕی، وەك دەنگی مەل و پەلەوەڕانی، کە لە هەواییێکی ناخۆشدا گیری خواردبێ. لەم مژ وتەمە قاوقیژی دەناوە. هەوجارەکان دەچوونە پێشی. هەوجارە رەشەکان دەمێك بەسەر

بەرزاییەکانەوە، کە وێنەی لێواری شەپۆلاوی دەریان، بەدەر دەکەوتن و جارێکی دیکە لەکەند و نشێوەکانی زەویدا لەبەر چاوان ون دەبوونەوە... .

هەوجارە چوار ئەسپییەکان لەسەرخەتی جووتەکان وەك ئەمە بوون.، کە لەخودی زەمین دەخزینە دەرێ و ئەسپەکانیان بە مکورِی و حەزێ کەوە هەناسەیان هەڵدەکێشا، دەتگوت بەسەر هەر چوار پەلاندا- راستدەبوونەوە. بەفر بەسەر مل و کەفەڵە زۆر گەرم و داغەکەی ئەسپاندا یەکسەر دەبووە ئاو و بەشێوەی رێچکەی نارێك بەلا پاڵویاندا دەچۆڕاوە. بۆ ئەسپەکان سەخت دەگوزەرا. زۆر سەخت دەگوزەرا، زەوی تەڕ بوو و سمی ئەسپەکان دەخلیسکا، جلەکان لەناو نم و شێدا سەنگینتر ببوون، گاسنەکانیان لەزەوی گیر دەکرد و لەلایە نەکێڵراوەکەی زەویان رۆ دەکرد. بەڵام نەدەکرا ئاگات لە هەوجارەکە بێ دەبووایە هەر جووت بکەن. بەیانی، کە هەتاو هەڵدێ و ئەم شەقارانەی زەوی هەڵدەپفمێن جووتەکە ئامادە و بەردەست دەبێ. نابێ وەخت لەدەست بدرێ. گاسن گیر دەبوو. جاری وابوو سولْتان مراد لە زینی ئەسپەکە دەهاتە خوارێ و بەداردەستەکەی کەستەك و تۆپلە گڵی لە گاسن و هەوجارەکە دەکردەوە و دوای ئەوە(ئاناتای و ئارکین)ی-، کە لە دوای ئەوەوە دەهاتن- بەهات و هاوارەوە دەنگ دەدا و گوێ ی لە وەڵامی ئەوان دەبوو سەرلەنوێ بەزۆری لە نێوان جل و لەشی تەڕی ئەسپەکانەوە خۆی دەگەیاندەوە ئەو ئەسپەی، کە زینی کردبوو و سواردەبۆوە و بەمجۆرە سەرلەنوێ بۆ پێشەوەی لێدەخورِینەوە. بەڵام بەفر نەیدەبرِیەوە هەوجارە رەشەکان وەك کەشتی لە ناو تەمی سپی دا مەلەیان دەکرد. لەو دنیا کپ و پڕ بەفرەکە هەموو دەنگەکانی هەڵلوشی بوو تەنیا های و هوی جووتێران بوو دەنگی دەهات.

- ئا- نا- تای!

- ئارکین- بە- ك!

- سولْتانمرا- ئا- دا!

ئاو بەدەم و چاوی سولْتان مراد دادەچۆڕاوە. ئاوێك، کە هی بەفر یان ئارەقە بوو، دەستەکانیان لە سەرمان و لە تەڕیدا ئەستور ببوو و شین ببوونەوە. قاچەکان لە دوولاوە بەلا پاڵووکەلەکەی ئەسپەکان، کە لێك دەخشان و تێك هەڵدەسوان، فشاریان بۆ هاتبوو. پێیەکانی سولْتان مراد ژانیان دەکرد و دەیویست لە جێگایەکیان دانێ بەڵام جێ نەبوو. ئەو دەیزانی، کە ئاناتای و ئارکین بەگ لەدواوەی ئەودا دێن و ئەوان بە هەرسێکیان شەش گاسن لە

کاردەخەن و لەبەر ئەوە مافی ئەوەیان نییە لــە نیــوەی ڕۆژدا شــەش گاســن، کــە زەویــەکانی ئەکسای دەکێڵن، ڕاگرن. گرنگ ئەوە بوو

کە ئەسپەکان توانایان هەبوو و لەپەل پۆ نەدەکەوتن. وە لەبەر ئەوە ئەو لەبیر کردنەوەی لە مەڕ ئەسپەکانەوە باوەڕی ئەوهابوو:

(ئەی پەروەردەکانی قەمبەر ئاتا ددان بەخۆتاندابگرن پتر هاوشــانی یــەك کاربکــەن، خــۆ هەمو ڕۆژێك کار ئەوەندە دژوار نییە. بۆ پێشەوە، بۆ پێشەوە، نچ. نچ. نچ. ئەی پەروەردەکانی دەستی چلپائاتا دان بە خۆتاندا بگرن. ئەولاترێ، ئەها ئەو پێشەوانە کۆتــایی جووتەکەمانــە. ئێمە لەوێ دەسووڕێینەوە و بۆ دواوە دەگەڕێینەوە. دان بەخۆتاندا بگرن و هەروا خێــرا بــڕۆن. من مافی ئەوەم نییە ئێوە لە گوشــاری هــەوجاڕ ڕزگاربکــەم. بــۆ ئــەم کــارە ئێمــە ئێوەمــان سەرتاسەری زستان ئامادەکردوە. چارەیێکی دیکە نییە. من ئێوە لە خــاکێکی نــەرم و ســفت لێدەخوڕم بۆ ئێوە گرانە بەلاّم ڕێگایەکی دیکە نییە گەنم و جۆی تێدا وەدەست بــێ. چکیشــی پیر دەڵێ هەر ئەوها بووە و هەرواش دەبێ. ئەو دەڵی، هەر پاروێك نان ئارەقەی بــۆ ڕێــژراوە، هەر کەسێکی ئەمە نازانێ و هەرکەسێکی کاتێ، کە ئەو نانە دەخوا ئەم بیرە ناکاتەوە. نان بۆ ئێمە زۆر پێویستە. زۆر پێویست. هەر لەبەر ئەمەشە، کە ئێمە و ئێوە لێرەکانە، لە ئەکساین. چابدار تۆ برای منی. تۆ ئەسپی بن نیری منی. تۆ هەوجارە ڕادەکێشی و منیش سواری ســەر پشتی خۆت دەکەی. ببەخشە، کە بەداردەستەکەم لێت دەدەم دەبێ ئەوها بکرێ. لێم مەڕەنجە چابدارەکەم. چونتورو تۆ لەلای ڕاستدا ڕێدەکەی، بۆ تۆ لەهەموان ناخۆشــترە بــەلاّم تــۆ دوای چابدار لەهەموان بەهێزتری. چونتور، چونتور، بەکبای بابم هەمیشە بەتۆیدا هەڵدەدا. بەبیرت دێ؟ بەراستی بەبیرت دێ، کە ئێمە پێکەوە چوینە شار... .

لەمێژە نامەی باوکم ناگا، ترسناکە، ئەی ئەسپەکان ئێوە لەوە ناگــەن. کــاتێکی خــەڵکی لەجەنگ ماوەیێکی زۆر نامە نانووسن زۆر ترسناکە. دایکم لە خــەمان و لەترســان بەتــەواوی لاواز بووە هەر چنگێك پێست وئیسقانی لێ ماوەتەوە. کاتێــك بــۆ بــاوکی ئاناتــای دەگریــان ئینکەمال ئاپای و دایکم لەهەموان بە کۆلتر دەگریان. ئەوان شتێك دەزانن... (نچ... نچ)[٢٨] چونتور و! هێز بدە بەرخۆت. ئاهای تۆ، کلك سپی، تۆش برای منی تۆ و چابدار ئەسپی مــام ناوەندین. تۆ ئەسپێکی جوانی تۆ کلکێکی سپی و نــا ئاســاییت هەیــە. بــەلاّم تــۆش خــۆت

---

(٢٨) نچ نچ: ڕەنگە ئەو دەنگە بێ، کە بۆ لێخوڕینی ئەسپ بەکاردەهێنرێ.

بەدەست هیلاکیەوە مەدە و ورەت بەرمەدە. من ڕێگات پێنـادەم مانـدوو بـی، کلـك سـپی. شەرمەزارم مەکە. ئاهای ئەسپە شیّ ی برام! تۆ ئەسپێکی سادە و رەسەنی. کاتیّ، کە من تۆم لەگەڵ چوار ئەسپەکەم هەڵبژارد، زۆرم ئومێد پێت بوو. تۆ کاردۆستی و خولّقت هێمنـە. مـن زۆر ڕێزیشم بۆ تۆ هەیە. تۆ لە کەنار و رۆخی ڕێدا دەرۆی و هەمیشە لەبەرچـاوی. لـەدەرەوە، کە تەماشا دەکەن لەرووی تۆدا لەبارەی هەموومانەوە داوەری دەنوێنن ئەسپەشیّ، برایەکـەم، منیش ناترەنجێنم. تۆ تەنیا راکێشە، ڕاکێشە و من گفتت پێدەدەم کاتێك ئێمە جووتمان کرد و تۆمان کرد و لەئەکسای تەواو بووین، هەر، کە گەڕاینەوە ئائیل تۆ وەك ئێستا لە رۆخ ڕێگادا دەرۆی تا هەمویان بتبینن و ئێمە بەبەردەمی مـالّی میرزاگـولّ دا تێدەپـەڕین و کاتێـك ئـەو رادەکاتە سەرجادە یەکسەر تۆ دەبینیّ، ئەسپە شێیەکەم، براکەی من. من نەمتوانی بـەر لـە هاتنم بۆ ئەکسای ئەو ببینم. دەسماڵەکەیم هەمودەم لە کنە. من دەسماڵەکەم لـە بـەفرو بـاران شاردبۆوە. من هەمیشە لە مەڕ میرزاگوڵەوە بیردەکەمەوە. مـن نـاتوانم بـیری لێنەکەمـەوە. ئەگەر من بیر لەو نەکەمەوە، هەمووشتێك بۆم پوچ و بیّ مانا دەبیّ و بۆ مـن ژیـان شـتێکی خۆش نابیّ... . نچ، نچ، پەروەردەکانی دەستی قەمبەر ئاتا، پتر هاوشانی یەك کاربکەن. بـۆ پێشەوە، بۆ پێشەوە، نچ، نچ، بەفر هەر وەك خۆی دەباریّ و هەر دەباریّ! چ بەفرێکی پڕ ئاوە. ئێمە هەموومان سەرتاپامان ئاوی لێدەتکێتـەوە. باشـدەبوو ئەگـەر پـیرەژن عـەقلی دەیـبڕی کایەکەی بەجلەکان دادەپۆشی. ئەگەر هۆشی پێدانەشکیّ کایەکە تەڕ دەبیّ و لە نێـو دەچـیّ. ئەوکاتە بەئێوە دوازدە سەر ئەسپ چیتان بدەینیّ بیخۆن؟ پێویست بوو بەر لـە بەرێکـەوتنمان بگوتبا، لەبیرم چو، لەو باوەرە دانەبووم بەفر بباریّ. ئەو پیرەژنێکی سەیرە. چاوەکانی پـڕ لـە تەماح و چاوچنۆکیە. هەر بەئەسـپەکانماندا هەڵـدەڵیّ و لـە تەماشـایان تێـر نـابیّ. دەڵـیّ چ ئەسپێکی زۆر باش و بخۆرن. دوو ئەنگوست چەوری بە پاڵوەکانیانەوەیە. لە زەمـانی زو زو دا ئەمجۆرە ئەسپانەیان لە پرسەکاندا سەردەبڕی. لەو بۆنانە ئەوەندەی مەشکیان دەیگرت گۆشتیان دەخـوارد. کـاتێکی گۆشـتی ئەسـپیان لـە مەنجـەڵێکی چـل سـەتڵیدا دەکولانـد، چـەوری-زادپ(لیقاوی چەوری داغی گۆشت ئەسپ)، کە ناوێکی سەیرە. ئـەم(زارادپ)ە یـان لەسـەری مەنجەلەکە دەگرت و ئەسکویان لیّ پڕ دەکرد و بۆ نەخۆشانیان دەبرد. پیرەژن دەڵیّ نەخۆش بـە خواردنی ئەم گۆشتاوە یەکسەر هەڵدەستێتەوە سەر پێیان. ئەم پیرەژنە چاو ودڵ برسیە هەر بیر لە چەورو چەوێلی دەکاتەوە. چاو لە ئەسپەکان نەدا باشە! ! . ئاه وێلی، کە لەقوتابخانە پێیان دەگوتین، چاولێدان، درۆیە و قسەی بیّ بنەوانە. لێیگەریّ با بۆخۆی ورێنە بکـا و هـەر بڵـیّ.

تەنیا خواردنەکەمان لەسەر وەخت بۆ ئامادەبکا. جێی سەرسوورمانە دوێنێ گۆشتی بزنە کێوی بۆ لێنابووین. بزنێکی لەڕ بوو بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زۆر باش بوو. گوتی): دوو راوچی سوارە لە کێوەکەوە هاتنە خوارێ. بەرەو رووناکایی چرای چادرەکە گەرانەوە و هاتن و بەشێك لە گۆشتی نێچیرەکەیان لێرە بەجێهێشت. زۆر سوپاس بۆ ئەو راوچیانە. دیارە لە داب و نەریت بەئاگان. دەیانەوێ جارێکی دیکەش راوی باش بکەن. لەبەر ئەمە، کە توشی کەسێك هاتون بەشیان داوە. ئەگەر ئەوان لەناو چیاوە هاتوونەتە خوارێ هەڵبەتە ئێمە یەکەمین کەسانێکین کە تووشیان هاتون. لەبەر ئەوە لەم ئاقارە کەسێکی دیکە نییە. لێرە هەرچەندەی لەو دەشت و کێوە ئەسپ تاودەی کەس نابینی. بەفر نەیدەبڕیەوە هەر دەباری. بەتەواوی لە پەلوپۆ کەوتین... )

ئەسپەکان وەستان، لە چوارپەل کەوتن... سوڵتان مراد لەم خوارەوە ڕاهات و بە زەحمەت خۆی لەسەر پێیە هەڵزەپەتاو و فشار خواردوەکانی خۆی راگرتبوو. وەك مەستان بەلا دادەهات هەوجاڕەکەی دورخستەوە. دڵی بەحالی ئەسپەکانی، کە لەبەر زۆر کارکردنیان شەلاڵی ئارەقەبوون، هەڵدەلەرزین و لە گوێچکەوە تا سمەکانیان تەڕ ببوون و زۆر بەزەحمەت و کفتیەوە هەناسەیان دەدا، سوتا و لە حەژمەت بەزەیی پێداهاتنەوەی دەستی بە ناڵە ناڵ کرد. بەفریش هەر وەك خۆی بێ پسانەوە دەباری و بەسەر پشت و مل و کەفەڵی ئەسپەکاندا دەتاواوە و هەڵمیان لێ هەڵدەستا و هەر دەباری و دەتاواوە. سوڵتان مراد کیسە سەنگین و تەڕەکەی لەسەر سەری لادا و فڕێی دا ئەولا و بەدەستە سڕبووەکانی. حەلقەی تسمەی هەوجاڕەکەی کردەوە و لەتوانای دانەما و دەستی بەگریان کرد و دەستی لەملی چاپدار کرد بەدەم گریانەوە لە ژێر لێوانەوە گوتی)ببوورن، من ببوورن) لەسەر لێوەکانی هەستی بە تامی تاڵ و سوێری ئارەقەی ئەسپەکە کرد. دەنگی ئاناتای، کە لەسەر خەتەکانی جووتەکەوە نزیك دەبۆوە هاتە گوێ: هۆ، سوڵتان مراد ئەوە چیدەکەی؟

سوڵتان مراد لە وەڵامیدا هاواری کرد:

- ئەسپەکان بکەوە!

١٠- بەپێچەوانەوە بەیانی رۆژی دوایی هەوا روون و بێگەرد بوو. هیچ نیشانەیێکی خراپی باری ئاو وهەوای دوێنی نەمابوو. تەنیا شێ و تەڕی، فێنکیەکی بوژێن و سەرحال کەرەوەی هەبوو، زەوی رەنگێکی سورباوی هەبوو، بەفری سپی تازە لە سەرچیایان دەدیترا. تیشکی خۆری سەحەری لە پشت کێواندا دەخزی و لەگەڵ شەفەقێکی دڵخۆشکەردا، کە نیوەی ئاسمانی

داگرتبوو، مژدەی هاتنی بەهاری بەجیهان دەدا. تێکڕای ئەکسای پان و بەرین لەگەڵ تێکڕایی شەقاری خەتە جووتی دەشت و دامێنی چیاکان و بەرزی و نزمیەکانی خۆی لە مەودایێکی دور و زۆر دوردا دەدیترا. لەبەر رووناکی و روونی هەوا زنجیرە چیا گەورەکانی ماناس، کە ئەوان لە داوێنیدا لە دایك ببوون و گەورە ببوون، دەهاتە بەر چاوان و دیار بوو، کە وەختی شەو داهاتن نزیکتر بووە. هەرچەندە، کە جێی باورکردن نییە بەڵام ئەو شەوە چیاکان لە ئەکسای بەرەو لای ئەوان هەنگاویان هەلێنابوو، تا جووتێران، کە بەیانی لەخەو هەڵسان شێت و شەیدای گەورەیی و پرشکۆیی، جوانی و توانای ئەوان بن. گزنگانێکی شکۆداربوو. ئەوان بەشێنەیی بۆ کارەکەیان خۆیان ئامادە کرد و چاوەڕێ بوون تا بایەك لەزەوی دا و نەختێ کزر بێ. لەو ماوەدا ئەسپەکانیان رنییەوە، ئەسپاپی ئەسپەکانیان بەرێکی ئامادەکرد و جۆی نم کێشاویان وشك کردەوە. هەتاو بەخێرایی گەرمی کرد. ئەوساکە بەرەو هەوجارەکان چون. گاسنەکان لەسەر خەتەکانی دوێنێدا گیرسابوونەوە. بە هەرسێکیان رایانکێشان و پاکیان کردنەوە و رۆنیان لە چەرخەکانیاندا (١) پاشدان ئەسپ و گاسنەکانیان لێك بەست و بەگوێرەی حسێبێکی کردبوویان دەبووایە تا شەو جووتەکەیان تەواو بکەن و لە سبەینێ بەیانییەوە دەست بەکێڵانی پارچە زەویەکی نوێ بکەن. (١) من قەت نەمبیستوە هەوجار چەرخی هەبووبێ، بەڵام دەبێ ئەمە جۆرێکی تایبەت بە خەڵك و نەتەوەیێکی دوربێ، کە ئێمە نەمان دیتبێ.

کار بە باشی دەچوەپێش. ئەسپەکان کەشەو حەسابوونەوە و بەیانی خزمەتیان کرابوو بە گوراح و چالاکیەوە کاریان دەکرد. بەکارەکە راهاتبوون و ئێستا ئەرکی خۆیان بەباشی ئەنجام دەدا. بەڵێ ئەوان بەکاری گران و هەوجار راکێشان خۆیان گرتبوو. بەڵام جووتی دوێنێ لەهەوا بەفرابنارەکە زەوی کێلگە کرز بۆوە و ئەو پارچە زەویانەی، کە لەگەڵ بەفر کێڵرا بوون لەژێر تیشکی هەتاو دا وەك کەستەکی گەورەی کزر بۆوە لەو ناوەدا دیار بوون. ئەمە مانای ئەوە بوو، کە زەوی (نەکێلراو) و(تێکچرژاو)، یعنی کێلاْنەکە زۆر باشی گرتبوو. ئەو رۆژە رۆژێکی باش و خۆش بوو. هەندێ رۆژی وا هەیە، کە هەموکارێك بەباشی بەدەستەوە دێ، ژیان بێ لەغایەت جوان وسادەیە. لەسەرانسەری زستان بێهورە زەحمەتیان نەکێشا و خۆئامادەکردنەکەیان بە فیڕۆ نەچو بوو بێهودە قوتابخانەیان بەجێنەهێشتبوو کە دەستەی ئەکسای کار دەکەن، هەوجارەکان لە کاردان. ئیمڕۆ دەبووایە ئەرگش و قوبادقولبێن. ئەوساکە پێنج هەوجار لەکاردا دەبوون، کە هەمووی دەکاتە دە خەتە جووت. ئەمە هێزێکە کە دەستەیەکی زەبروەشێنی بەراستی دێنێتە ئاراوە. لەدواییدا تۆو دەکەن. دوایش هەر ئەوە

دەما چاوەڕێ ی حاسلات و بەرهەم بکەن. گەنمە بەهارە لە لایەنی زۆری بەرهەمەوە لە گـەنمی پایزی بەدوا دەکەوێ و بەڵام لەباتی ئەمە بەتامترین نانی لێ دروست دەکرێ. کارەکان ڕێگای خۆیان دەگرنە بەر. باران دەبارێ. ناکرێ کاتێك، کە ئەوەندە کار دەکرێ باران نـەبارێ. بـاران هەر دەبارێ. تەنیا پێویستە، کە لەوێ لەبەرەی جەنگ خۆیان راگرن و هێزەکانمان هێرش بکەن تا ئەم گەنمە بە سەلامەتی و خۆشبەختی شین بێ و نانەکەی لە قورگدا گیر نـەبێ. ئـەوان بـەم پێیە لە کێڵگە دا دەڕۆیشتن. سوڵتان مراد لە پێشی پێشـەوە بـەدوای ئەویشـدا لـە مـاوەی دووسەد پێیەك ئاناتای و لەماوەی نیو کێڵۆ مەترێك ئـارکین بـەگ لـە کـاردابوون. تادەهـات هەتاو گەرمتردادەهات و لەبەرچاویاندا سەوزایی و پووش و پەلاشی لەگەڵ توێژێکی تـەنك دا سەرانسەری دەشتەکانی داوێنی چیای دادەگرت. وەك ئەوەی ئەفسانەبێ. زەوی، کە گیـانێکی تازەی بەبەرداهاتبوو هەناسەیێکی شێداری دەدا. هەوجاڕو گاسنەکان لە زەویەکانی ئەکسـایدا دەجمان و سەر بارستی خەتە جووتی تازەیان لـەدوای خـۆدا بـەجێ دەهێشـت. کلاوکوڕەیـەك لەفڕکەی باڵیدا و دەنگی خوێندنەکەی لەو نزیکانەوە بوو و لە جێگاییێکی دیکەشەوە دانەیەکی دیکە خوێندی، لـەجێگاییێکی دیکەشـەوە دەنگـی یـەکێکی دیکـەش هـات. سـوڵتان مـراد زەردەخەیەکی گرت. بەرەزاییەوە دەخوێنن. نەمالێك، نە بەرگ و نە سەرچلێك شـك دەبـەن و لەودەشتە روتە بەهەر سەختیەك بێ دەژین و رازیشن. لەبەهار رازین، لەهەتاو رازیـن. ئـەدی دوێنێ لەکوێ بوون. چۆن لەگەل ئەو هەوا ناخۆشەدا هەڵیان کردوە؟ بەڵام ئەو هەوایـە تـەواو بەڕێمان کرد. بەهار چیدیکە دواناکەوێ. کـاریش هێشـتا زۆرە و ئەمـە تـەنیا سـەرەتایەتی. دەباشە. ئەمرۆ ئەرگش و قوباد قول دێن و ئەوساکە هەموو ئەندامانی دەستە بەهەمو هێزیان هەڵمەتی بۆ دەکەن. کارەکەمان ڕێگای خۆی دەگرێ و دەچێتە پێشی... .

سوڵتان مراد کاتێك هەوجارەکەی ئاراسـتەدەکرد سـوارێکی لەوبەریـەوە دیـت. ئـەو لـە ماوەییێکی دوری رۆخ جووت جارەکە دەڕۆیی و تەماشای جوتێرەکان دەکرد. ڕێگای بەرەو نـاو چیا بوو و تفەنگێکی لەشان و کلاوێکی کەوڵی تا بناگوێیان لەسـەر نـابوو. ئەسـپەکەی شـێ وئێسقان درشت بوو مندالەکانی دیکەش ئەویان دیت و دەستیان بە بانگە بانگ کرد:

- هۆ هۆ راوچی وەرە بگەرێوە لای ئێمە!

بـەڵام راوچـیەکە وەلامـی نەدانـەوە. ئـەو بـەبێ ئـەوەی نزیـك بێتـەوە لـە رۆخ زەویـە جووتکراوەکە دەرۆیشت و هەر تەماشای ئەوانی دەکرد. سوڵتان مراد لە پەیدابوونی ئەو سوارە

خۆشحاڵ بوو ئەسپەکانی وەستاند و کەسەر ڕکێبی ئەسپەکەوە هەڵسا سەرپێیان و بەرەو ئەویَ هاواری کرد:

- هۆ هۆ راوچیەکە بۆئەو و(شیرئەلگوەی)[٢٩] کە پێت دابووین سوپاس.

دەڵێم سوپاس بۆ گۆشتەکەتان!

بەلاّم سوارەکە هەمدیس وەلاّمی نەداوە. وەك ئەوەی نەگویَ ی لیَ بوویَ و نە تێی گەیشتیَ، کە باسەکە چیەو بەخێرایی لە پشت تەپەوگردەکانەوە لەچاواندا ون بوو. ئەمە مانای ئەوەیە، کە کاتی نییە و بۆ ئەو کارەی، کە لەبەری بوو پەلەی بوو.

نزیکەی دوایی نیو سعاتی دیکە راوچی دووەم پەیدا بوو. ئەویش روی بەرەو کێوان بوو و ئەویش تەیار بوو. بەلاّم ئەو لەکۆتایی ئەولای دیکە بەرەولایێکی دیکەی کێڵگە دەڕۆیشت و وەك راوچیەکەی دیکە دووربەدوور تەماشای دەکردن و بەرەولای ئەوان دەیروانی و بەبێدەنگی رابورد و نەگەراوە و ماندونەبوونی لە جوتێرەکان نەکرد. لەکاتێکدا بە پێی ی عادەت رێبوار دەگەڕێنەوە و سلاّو لە جوتێر دەکەن ئاواتی کارو بەرهەمی باشی بۆ دەخوازن. چکیشی پیرەمێرد دەڵیَ، خەڵکی گۆراون. رەنگە هەقی نەبیَ. ئەو پیرەمێردێکی هۆشمەند و تێگەیشتووە. دوایی ورووژاوترین رووداو رویدا. بەر لەهەموان ئاناتای گویَ ی لیَ بوو. ئافەرین! ئەمە ئەوبوو، کە بەهەموو هێزی هاواریکرد:

- قولێنگ! قولێنگ دەفرِن!

سولّتان مراد سەیری ئاسمانی کرد ساف بوو. لەرادەبەدەر شین و تاچاو برِوانیَ بێکۆتایی بوو لەو ئاسماندا قولێنگ دەفرِین و ئارام و لەسەرخۆ باڵیان دەکوتاو جێگۆرکێیان دەکرد لەدورەوە دەنگی نێوان قولێنگەکان دەهات. پۆلێکی گەورە بوو. ئەوان زۆر بۆ پەرِەگەی ئاسمان هەڵکشابوون. بەلاّم دیسانەوە ئاسمان زۆر بەرزتر بوو. ئاسمانی بێسنوور و پرِشکۆ. و پۆلە قولینگەکان وەك یەك دورگەی بچوك و زیندوو و لەم ئاسمانەوە بیَ سەروبنەدا مەلەی دەکرد. سولّتان مراد سەری بەرزکردبۆوە و تەماشای دەکرد. دوایی لە پرِێکدا بە خۆی هاتەوە و بەهەموو هێزی هاواری کرد:

- هوررِرا! قولێنگ قولێنگ!

---

(٢٩) شیرئەلگو: ئەو بەشە گۆشتەی راوچی دەیبەخشیَ.

ئەوان هەرسێکیان بە جوانی قولێنگەکانیان دەدیت. بەمەش وەم ئەوەی شتێکی گرنگ و تازەی چاوەڕوان نەکراو بەیەك بلێن بانگەوازیان دەکرد:

- قولنگن! قولنگن! قولێنگ!

سولتان مراد بەبیری هاتەوە، کە زو پەیدابوونی قولنگان لە ئاسمان نیشانەی خێرە. ئەو لەسەر زینەکە دانیشتبۆوە و هاواری بۆ ئاناتای کرد:

- قولنگی زو پەرەواز، پێشبینی خێرو خۆشیە! بەرهەم، حاسلات بەسەرماندا دەبارێ و باش دێتە بەرهەم. ئاناتای باش گوێ ی لێنەبوو:

- چی چی؟

- بەرهەم، بەرهەم گەلێ باش دەبێ.

ئاناتایش بەرەو کن ئارکین بەگ گەڕاوە و هاواری کردێ:

- بەرهەم. بەرهەم، فرەباش دەبێ.

ئەویش وەلامی داوە:

- گوێم لێبو، گوێم لێبو! بەرهەم خاس دەبێ.

قولنگەکان لە ئاسمانی شیندا دەفڕین و دادەهاتن. ئەوان بەبێ پەلەکردن دەفڕین و باڵەکانیان بە نەرمی و شێنەیی لێکدەدا و جاری وابوو بە پۆل و جاری وا هەبوو تاك تاك دەفڕین، هەرهەمووی تێکرا قاوقاژیان بوو و بانگی یەکدیان دەکرد و سەر لەنوێ هێمنی و ئارامی دەکەوتەوە ناویان. لە هەواییێکی بێگەرد و ڕووندا ئەو ڕۆژە، گەردەنی درێژکرد و و دەتگوت تاشراون و، دەنوکی باریك و پێیەکانیان، کە هی هەندێکیان نیوە هەڵکێشراو و هەندێکیان بەتەواوی بەخۆوە نووسێنرابوو، بەجوانی دەدیترا. جاری وابوو لەکاتی فڕینیاندا کۆتایی سپی شاپەڕەکانیان لەناو باڵەکانیاندا بەرچاو دەکەوت. لەدواییدا جووتێرەکان زانیان، کە پۆلە قولنگەکە وابەرە بەرە بەرەو خوارەوە دادەکێشن. هەر قولنگ بوو زێتر دەنیشنەوە سەر زەوی و وەك ئەوە وابوو ڕووداوێك ئەوانی بەرەو دامێنی چیا دوردەستەکانی دەبرد. سولتان مراد لەژیانیدا قەت قولنگی لە نزیکەوە نەدیتبوو. ئەوان هەمیشە لە ئاسماندا وەك خەون و خەیاڵ و لەو پەڕەگەیدا دەفڕین.

سولتان مراد هاواری کرد:

- سـەیرکەن دەنیشـنەوە، دەنیشـنەوە! هەرسـێکیان بـەرەو ئـەو خـوارە رایـان کـرد هەوجارەکانیان بەجێهێشت و بەرەو ئەوێ، بەرەو ئەو شـوێنەی، کـە قولێنگـەکانی بـۆ نـەوی دەبوون ڕایان کرد.

خێرا، بەهەمو توانایان دەبەزین. دەیانویست لەنزیکەوە ببینن، کە قولنگەکان چۆنن؟ زۆر باش دەبوو. سولتان مراد زۆر بەباشی رای دەکرد. زەوی لـەژێر پێیـدا بـەرەو ئـەو دەهـات و ئەویش بە پێچەوانەی ئەوەوە رایدەکرد. کێوە پڕ لە بەفرەکانیش لەگەڵ زەوی بەرەو پـیری ئـەو دەهاتن و پۆلە قولنگەکەش بە چەرخەلە لەئاسماندا، لە ئاسمانێکدا، کە سـولتان مـراد چـاوی لێهەڵنەدەگرت بەرەوپیریەوە دەهات. لەتاو راکردن و خۆشیا، هەناسەی بەنـد دەبـوو. وە ئـەو لەکاتی راکردن بە خۆشیەوە، هەر لەگەڵ ئەوەی، کە رای دەکرد بەرەو قولنگەکان بیری کردەوە. ئەگەر پەڕ لە قولنگەکان بکەوێ ئەو دەیبینێتەوە و هەڵیدەگرێ و بەدیاری دەیداتە میرزاگوڵ. چیرۆکەکەشی وەك خۆی بۆ دەگێرێتەوە. تەنیا دەبوایە بیانگاتێ و بیانبینێ. سولتان مراد هەر بەو شێوەی، کە لە گیانی خۆیدا هەستی بە پەیوەندییێکی خۆشی میرزاگوڵ دەکرد، رای دەکرد. ئەگەر دەیتوانی هەر ئێستا بەخۆی و پەڕە قولنگەوە بەرەو ئەو رایدەکرد، رێك و راست بەپەڕە قولنگەوە. . بەرەو ئەو... . .

١١- ئەوان رایاندەکرد بەبێ ئەوەی ئاگایان لێبێ چاوێکی بێ بەزە بەبێ ئەوەی پێڵوەکـانی بتروکێنێ ئەوانی کردبووە نیشانەی تفەنگ و لوولەی تفەنگەکەی لەسەر ئەم بۆ ئەویان دەبرد و ئینجا سێرەی لە سێیەم دادەگرت. ئەو چاوە پیسە پڕ لە نەفرەت و بێزارییە تەماشای دەکـرد، کە چۆن ئەو نەوجەوانانە لە بەرانبەری کونی سێرە بەرەو قولنگەکان رایان دەکرد. زەمـین لـەو کونەوە زۆر گەورە دیاربوو، بەڵام ئەوان زۆر بچکۆلە دیاربوون. ئاسمان بەرانبەری نیشانچیەکە بەسەر سەری منداڵەکانەوە زۆر گەورەو ئەوان لەبەرانبەری زۆر بچوك بوون. ئەگەر پەلا پیتکە پەنجەی پێوەنرابا ئەوان نابوت دەبوون. ئەم روداوەش دەکرا لەیەك چرکەدا رووبـدا. بـۆ ئـەوەی لەبەرانبەری سێرەکە بەدیار نەکەون تەنیا ئەوە بەس بوو پەنجە بەلاپیتکەوە بنرێ. ئەو کەسەی سێرەی دەگرت هەناسەی خۆی رادەگرت و دەیگوت:

- باشمان نیشانە لێداگرتن. ئێستا دەکـرێ هـەمویان لـەناو ببـەین، بـەجۆرێك نووزەیـان لەبەرەوە نەیـە. ئەویدیکـەیان کـەلغاوی ئەسـپەکانی بەدەسـتەوەبوو. ئەسـپەکانی بـردە نـاو چالاوێك، کە وەك کونە گورگ وابوو و لەژێر گردێکەوە بوو، گوتی:

- وێلی کە، دیارە شێت بووی. یاری وگاڵتە بەگوللە ناکرێ، لەخۆرایی نیشانە دادەگری.

کەسەکەی نیشانەی داگرتبوو بێدەنگ وقسە کاکیلەکان و شـەویلاکی بەسـەریەکدا فشـار دەدا بەڵام لوولەی تفەنگەکەی هەر وەك خۆی راگرتبوو. ئەو کەسەی ئەسپەکانی گرتبوو وەك فەرماندەییێك فەرمانی داو گوتی:

- پێتدەڵێم سەرت دەرنەهێنی. لەراکردن بێزار دەبن و دەگەرێنـەوە، کـە پەیوەندییـەکیان بەتۆوە نییە. زەلامەکە گویّ ی بەقسەی ئەو نەدا. بە درێژبوونەوە رووەمەتە نەتاشراوەکەی بـە قۆنداغی تفەنگەکەوە نابوو لەکونی نیشـانەکەوە بەلەزەتـەوە، چـاوەدێری منداڵـە بـیّ ئاگـاو خەیاڵەکانی دەکرد بە قاوقیژەوە بەدوای قولنگاندا هۆشیان لەدەسـت دابـوو. مـرۆڤ عەکسـی دەیگریّ. هەر رادەکەن و پێدەکەنن! رادەکەن و پێدەکەنن! دڵیـان خـۆش بـووە! بەسـیّ گوللـە ئەوهام رادەخستن، کە جووڵەیان لەبەر ببڕیّ. رادەکەن و پێدەکەنن! دیار نییە لەبـەر چـی ئـەو سەگبابانە وا رادەکەن... .

جوتیارەکـان مـاوەییێکی زۆر رایـان کـرد، بـەڵام ، کـە گەیشـتنە سـەرگردەکە، دیتیـان قولێنگەکان دیسان بەزر دەبنەوە، منداڵەکان لە تاوان ئاگریـان گرتبـوو. رەنگـە هـەر لەبـەر ئەوەندە بووبیّ، کە قولێنگەکان خەریك بوو بنیشنەوە؟

منداڵـەکان وەسـتان و هەناسـەیەکیان تـازە کـردەوە. شـەکەت ببـوون. سـولتان مـراد دیسانەوەش بۆ دورتر رایکـرد و کـاتیّ وەسـتا، کـە فرمێسـك لەچـاوانیدا قـەتیس مـابوو و قولێنگەکانی بەریّ دەکرد. دوایی ئەوان گەڕانەوە و سەرلەنویّ بە کێلاّنی زەویەکانی ئەکسـای درێژەیان داوە. رۆژێکـی زۆر خـۆش بـوو. دوای نیـوەرۆ عـارەبانـەی کۆڵخـۆز بـەبارەکاوە بـۆ ئەسپەکان گەیشتە جیّ. پەتاتە، گۆشت، ئارد و داروچیلکەی بۆ هێنابوون و بار بارەکە گوتی: چکیش سەردەستە ئاگاداری کردم، کە بەیانی خۆی و دوو هەوجاڕو ئارگش قوبادقول دێنە ئێرە و گوتی بەسولتان مراد و کوڕەکانی دیکەش بڵیّ. مگێڕیان تێك نەجیّ و تووڕە نەبن. بڕیـاری داوە و بەیانی دەستەکەیان بەتەواوی کاردەکەن. ئەمە دەبیّ ببیّ و دوای دوو رۆژان تینعەلیۆف سەرۆکی کۆڵخۆز دێتە لاتان. بار بەرەکـە ئـەم دەنـگ و باسـانەی هێنـا. هـەمویان پێکـەوە فراوێنیان خوارد و کاتێك دەیانویست سەرلەنویّ بچنەوە سەر جووت، پیرەژن بە سولتان مرادی گوت، دەیەویّ بچێتەوە ئائیل و بەیانیش لەگەڵ چکیش دا بگەرێتـەوە. گـوتی، کـە لـەئائیل کاری پەلەی هەیە و دەبیّ بۆ شوشتنی جل وبەرك سابون بێنیّ. بـۆ ئـەوەی ئـەوان بـەبیّ ئـەو بەبرسێتی نەمێننەوە، نانی بۆ هەمو رۆژەکەیان و شۆرباویشی بۆ دروسـت کـردون، تـا ئـەوان تەنیا گەرمی کەنەوە و بیخۆن. سولتان مـراد لەگـەڵ ئەوەشـدا حـەزی نـەدەکرد بـڕوا بـەڵام

ناچاربوو رازی بێ. نەدەبوو چەند و چونی لەگەڵدا بکرێ یان ڕێگای لـێ بگـیرێ. جووتێرەکـان بەرەو گاسنەکانیان چونەوە. هەر هەمو ڕۆژەکە پڕژانە سەر کێلاَنی زەویەکـە. سـەر لـەئێوارە گەڕانەوە. ئێستا هەتا چاوهەڵخەی کێڵگەیێکی گەورە ئامادە کرابـوو. ئەمـە یەکـەم کێڵگـە بوو. دەبووایە زەوییێکی زۆر بکێڵن. ئەمە سـەرەتابوو ئەمـەی دوایـی لـە پـاش ئـەوەوە دێ. بەرەبەری ڕۆژ لە زەردان دوا خەتیان کێلاَ. سەرەخەت و پەناو ئەو شوێنانەی، کە بـەجێمابوون کێلاَیانن و بەبێ خۆ دواخستن هەوجاڕەکانیان بۆ سەر ئەو زەویە نوێیە برد، کە دەبووایە بەیانی دەستی پێبکەن. تا ئەسپەکانیان کردەوە و بەسواری گەیشتنەوە خێوەتـەکانیان، هـەوا تاریـك داهات. لەناو چادرەکە کەس نەبوو. پیرەژنەکە ماوەییێك بـوو ڕۆیشـتبوو. گـرنگ نییـە. ئـەو بەیانی دەگەرێتەوە. بەرۆژ ماندو و کفت بوون. لەسەرەخۆ کـەل و پەلـەکانیان لـە ئەسـپەکان کردەوە و بردنیانە ناو چادرەکە و هەرشتەیان لەسەر جێگا و شوێنی خـۆی دانـا. هـەر دوازدە ئەسپیش لە جێگای خۆیان، لەبەردەم کۆنە عارەبانە بێ چەرخەکە کە لە بـاتی ئـاخوڕ لەگـەڵ خۆیاندا هێنابوویان، بەسترانەوە و کاییێکی زۆریان بـۆ ئەسـپەکان لـەناو کۆنـە عارەبانەکـەدا روکردبوو و بڕیاریاندا بەیانی زوتر هەڵسن تا ئەسپەکان بڕننەوە و لـە ئارەقـەی وشـکەوە بـوو پاکیان کەنەوە. لەتاریکیدا دەست و چاوی خۆیان شوشت و ئاگریان لەناو چادرەکەدا کردەوە و لەبەر ڕووناکایی ئاگرەکە ئەو خواردنە ساردەیان خـوارد، چـونکە بـۆ گەرمکردنـەوەی هێـز و توانایان تێدا نەمابوو. ڕاکشان، کە بنوون. سوڵتان مـراد لەهـەموان درەنگـتر نووسـت. ئـەو پێشی نووستنی جارێکی دیکە لە چارەکە هاتەدەرەوە و سەرێکی لە ئەسـپەکان خـوارکردەوە. ئەسپەکان ئارام و هێمن ڕاوەستابون و دەم و قـەپۆزیان لـەنێو کـادابوون و وەك هـاران کـاو و وێنجەی وشکیان خرم خرم دەجوی و لەشەکەتیان پرمەیان دەکێشا. ئەوان لـەم بـەرو ئەوبـەری هەردولای عارەبانەکە یەك بەرانبەری یەکێ کپ و هێمن وەستابوون. لەهەر لایەی عارەبانەکە شەش سەر ئەسپ وەستابوون. لە هەواکە دەوەشاوە، کە بۆ خۆیان بـەئارامی بوەسـتن. مـانگ تەنیا هیلالێکی باریکی لێدەدیترا، کەوانێکی زۆر باریك.

سوڵتان مراد کەمێك ڕێ ی کرد. دیار نەبوو بۆچی ترس دایگرتبوو. ئەو نـاوە کەسـی لێ نەبوو، بێدەنگی مەرگ ئاسا. شەوی تاریك و بێ کۆتایی. ئەو کاتانەی سەر گەرمی کار دەبوو بۆی بەدەردەکەوت، کە ئاگای لەوە نییە، کە لەم جێگایەدا شـەوان لـە بیابانـدا بیابـانی دورە دەست دنیا چەندە ترسناکە. ئەو بەخێرایی گەڕاوە بۆ خێوەتەکە و لەجێگای خۆیدا دانیشـتەوە و دیسانەوەش ماوەییێك خەو نەیـدەبردەوە. ئـەو لەتاریکیەکـدا بەچـاوی کـراوەوە ڕاکشـابوو.

لەبارەی زۆر شتانەوە بیری دەکردەوە و بابەتی جۆراوجـۆری بەمێشـکدا دەهـات. لـەناکاو خـەمێك دایگرت و دڵی بۆ مالەوەیان تەنگ بوو. دەبێ دایکی بـەبێ ئـەو لـە چ حالێکـدا بـێ. ئـەوەی لێ روونبوو، کە خەبەری بابی نییەو ئەوە هیچ. ئەگەر نامەیێکی دەبوو ئیمڕۆ کابرای باربەر دەیهێنـا و داوای مژدانەی لێدەکرد. هەرچی ویستبا دەیدایێ. بـەڵام دەیتـوانی چـی بـداتێ. ئـەو، کـە لێـرە شتێکی نییە. گفتی نیو گونییە گەنمی پێدەدا. پایزان، کە لەکۆڵخۆز گەنم دەدەن، ئەوساکە دەیدایـە ئەو بەبیر خۆی هێناوە، کە چۆن حاجی مراد قسـەی لێـوەرگرت، کـە ئەگـەر باوکیـان لـە جـەنگ بگەڕێتەوە لە ئێزگەکەی شەمەندەفەر بەرەو پیری دەچـن و هـەر دووکیـان سـواری چـابدار دەبـن و تاویدەدەن. لەبەر ئەوەی سوڵتان مراد برا گەورەیە لە پێشەوە و ئـەویش لـە پشـتەوە دادەنیشـێ و هەرکە دەگەنە باوکیان چابداری دەدەنە دەست و خۆشیان لەتەك ئەودا رادەکـەن و دایکیـان لەگـەڵ خەڵکێکی زۆردا بەرەو پیریانەوە دین. سوڵتان مراد لە بەبیرهاتنەوەی ئـەو شـتانە دڵـی تونـدبوو و ئاخێکی پڕ لەخـەمی هەڵکیشـا و بـیری کـردەوە. ئەگـەر خۆشـیەکی وا بیتـە ئـارا. چـابدار لـە هەوجارەکە دەکەمەوە و چوارناڵە بەدوای دا تاوی دەدەم و لەپاشدا سەد جار پتر کار دەکەم. دوایـی ئەو لە تاریکیدا بەیادی ئەوەی، کە لەبەردەم بەردەبازەکەی سەر روبـار چـۆن گەیشـتە میرزاگـوڵ و پێکەنی. هەتا لەو کاتەیشدا ئەو بـەگرتنی دەسـتی و کەچـۆن دەسـتی لـەناو دەسـتی ئـەودا بـوو گوتی(من خۆشحاڵم! من زۆر خۆشحاڵم! مەگەر تۆ نازانی، کە چەندە خۆشحاڵم و چەندە خۆشـحاڵم! ). وە لەوەی، کە ئەو لەو کاتدا چۆن لە بوونی میرزاگوڵدا خۆی ناسی و چـەندە بـە کـەف و کـوڵ و جۆشی هێناو چەندە لەو بارەوە خۆشحاڵ بوو، کە میرزاگوڵ، خودی ئەوە، بـەڵێ هـەموو ئەمانـەی هەستپێکرد. هەرگیز نابێ ئێستا میرزاگوڵ نەخـەوتبێ. رەنگیشـە، کـە لـەم چـرکەیەدا بـیر لـەو بکاتەوە. ئاخر میرزاگوڵ و ئەو یەکێکن، سوڵتان مراد دەستێکی بە دەسماڵەکەی ئەو داهێنا، کە لە باخەڵی بچوکی چاکەتە سەربازیەکەی دابوو و نەوازشی کرد و نازی کێشا... بەمجۆرە سـوڵتان مـراد بەرەبەرە خەو بردیەوە. چووە خەوێکی قووڵەوە. دوایی خەونێکی قۆڕی دیـت. لەخەونیـدا کەسـێك ئەوی خنکاند و دەستەکانی شەتەك دەدا و یەکسەر بەئاگا هاتەوە و هێشتا نەگەیشتبوە ئـەوەی لـە ترسان هاوار بکا، کە دەستێکی گەورە و گرانی و شەقارشەقاری، کە بۆنی توتنی دەدا لەسـەردەمی دانرا و کەسێك، کە سیخە سیخی سینگی دەهاتە گوێ و بۆنی جگەرەی لە دەمەوە دەهات، لە بـن گوێ ی ئەو دا گوتی:

- بێدەنگ بە، ئەگەر دەتـەوێ بـژی! . ئـەو بـە فشـارەوە دەمـی سـوڵتان مـرادی کـردەوە و بەدەستێکی ئاسنینیش شەویلاکەکانی تا بن کاکیلەکانی لێك کردبـۆوە بـەجۆرێکی وا ژان و دەردی

پێگەیاندبوو. دەمی بە پارچە پەڕۆیێکی کۆن ئاخنی بوو، تا سوڵتان مراد ویستی بەئاگابێ و بزانێ چ باسە و ئەوە چیە رودەدا، دەستەکانی لەپشتەوە بە پەتکێك بەسترابۆوە. ئارەقەیێکی دەرکرد و هەموگیانی کەوتە لەرزین. ئەم دوو کەسەی ناو چادرەکە کێن و بۆچی ئەویان بەستۆتەوە؟

یەکێك لەوان بەیەکێکی دیکەی گوت:

- ئەمە تەواو. دەست بە ئەوانی دیکە بکەین.

ئەوان لە تاریکیدا بەرەو ئەو جێیە چون، کە ئاناتای لێ نووستبوو. ئاناتای دەنگێکی لێوەهات و کەوتە جولە و تەکانان، بەلاّم ئەویشیان قۆڵ بەست کرد. بەلاّم ئارکین بەگ وەك زەبرێکیان بەسەری دادا بێ، چونکە نالەیێکی لەبەرەوە هات و کپ بۆوە. سوڵتان مراد هێشتا نەیدەتوانی لەوە بگا، کە مەسەلەکە چیە. خەریك بوو پارچە کۆنە قوماشەکەی ناو دەمی ئەنجن ئەنجن دەکرد. هەناسەی تەنگ ببوو. دەستەکانی لەژێر فشاری کندرەکە[1]دا بوو. نێو خێوەتەکە تاریك و تنۆك بوو. ئەوانە کێن. بۆچی ئەوانە هاتونەتە ئێرە. بۆچی ئەوها بەم شێوە لەگەڵ ئەواندا جولاونەتەوە، چیان لێیان دەوێ. رەنگە بیانەوێ بیانکوژن، بەلاّم لەبەرچی؟ سوڵتان مراد دەستی بە خۆ راوەشاندن و جووڵە جووڵ کرد، ئەو کاتە یەکێك لەو پیاوانە بە ئەژنۆی فشاری خستە سەر ئەو بە ئەنگوستە تۆکمە و ئاسنینەکانی خۆی مستێکی بەسەری دادا و لە سەرخۆ و بەئاشکرا ووتی:

- بیبڕەوە، تەکان مەدە. گوێت لێیە یان نا؟ دەڵێ ی تۆ لێرە هەموو کارێکت بەدەستە. ئێمە دەستی ئێوەمان بەستۆتەوە لەبەر ئەوە ئێوە بەرپرسی هیچ نین، تێگەیشتی؟

ئەو بەدەم ئەم قسانەوە جارێك ئەوەهای دەگوت و جارێکی دیکە نینۆکە ئاسنینەکانی بەسەریدا دەکێشا و دەیگوت:- بۆ خۆتان عاقل بن- هەمووشت تەواو دەبێ.، کە بەدواتاندا دێن. هەمووی هەر وەك خۆی بگێڕنەوە. پەیوەندیی بە ئێوەوە نابێ. بەلاّم ئەگەر کەسێك لە ئێوە بیەوێ شتێك بکا وەك تولە سەگ دەیتۆپێنم، بێدەنگ بن! بە بێدەنگی درێژ بن، نامرن.

ئەوان بە لرخەلرخەوە هەناسەیان دەدا و جوێنیان دەدا و ئاخ و ئۆفیان هەڵدەکێشا و تفیان دەکرد و لە خێوەتەکە چوونەدەرێ. سوڵتان مراد گوێی لێبوو، کە ئەوان لەلای ئەسپەکاندا خەریکی کارێکن. ئەسپەکان ڕەوی بوونەوە و چوارپەلیان بەزەویدا دەکوتا و فڕەفڕی کونە لوت و قەپۆزیان دەهات. دوای کەمێك ڕمبەی سمەکانیان و زەبری داردەست هاتە بەرگوێ کەوت، دیسانەوە جوێنێکیان داو رمبەی سمی ئەسپەکان کەم کەم و بەخێرایی تەواو کپ بۆوە. تەنیا ئەو وەختە

---

(١) کندر: کوریس، شریت

سولّتان مراد ئاگادار بۆوە و هەموو شتێك رووی دابوو، و بەدەرکەوت، ئەسپ دزەکان هەموو ئەسپەکانی جووت و کێڵی ئەوانیان بردبوو. خەم و تووڕەیی گیانی ئەوی تێك قوپاندبۆوە. سولّتان مراد بە خۆ راتەکاندن و خۆ راپسکاندن هەولّی دەدا دەستەکانی ئازاد بکاو بیانکاتەوە. بەلاّم هەولّەکانی بێ ئەنجام بوون و بەدەم هەناسە گیرانەوە دەستی بە سووراندنی سەری و هێنانە دەرەوەی پارچە کۆنە قوماشەکەی ناو دەمی کرد، دەمی دەچوزاوە، خوێنی لێدەهات و لەتاو فشاری تێئاخنینی پارچەکە ژانی دەکرد. لەگەلّ ئەمەشدا سەرەنجام توانی پارچەکە لە دەمی فرێداتە دەرەوە. وەك ئەوە بوو گیانی ئازادبێ. سەری گێژی دەخوارد بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا توانیی کەمێك سەری خۆی لەسەر زەوی بەرزکاتەوە و هاوار بکا:

- کوڕینە ئەمە منم! ئەمە منم، منم قسە دەکەم.

بەلاّم کەس وەلاّمی نەداوە. ئەو گوێ ی لێبوو، کە ئاناتای و ئارگین بەگ لە جێگای خۆی تەکان لەسەر تەکان دەدەن. ئەوجا گوتی:

- کوڕینە نەترسن. من ئێستا، من ئێستا بیرێك دەکەمەوە، تەنیا ئێوە گوێم لێ ڕاگرن. ئاناتای، تەکاندە، تۆ لەکوێ ی؟

ئاناتای لە حالێکدا لە جێگای خۆی بەرزە پێ بوو- منگە منگێکی کرد و کەوتەوە.

- ئاناتای سەبرت بێ! لە جێ ی خۆت بە! سولّتان مراد بەسەر جل و بەرگ و جلی ئەسپەکاندا بەرەو ئەو خزی:- ئێستا درێژ بەو پشتت لە من کە.

گوێت لێیە، دەلّێم پشتت لە من کە.

ئێستا ئەوان پشت بە پشتی یەك درێژببوون و سولّتان مراد بە پەلکوتان لە تەنافەکەی دەستی دۆستەکەی دەگەڕاو دەپشکنی. ئەو دەستووری بە ئاناتای دەدا چۆن درێژ بێ و بگەڕێتەوە و دەستی بەرگرێیەکان کەوت. سولّتان مراد هەر وەك ئاناتای ژێر دەکردەوە، کە لەژانی دەستەکانی دان بە خۆیدا بگرێ. پەنجەکانی بە ئالقەی تەنافەکە کەوت و رای کێشا و تەنافەکە شل بۆوە و لە دوایی ئەوەدا ئاناتای خۆی دەستەکانی لەناو کۆتی تەنافەکەدا دەرکێشا دەرەوە...

١٢- ئەسپ دزەکان بەکاوە خۆ لێیان دەخوڕی و ناوناو بە چوارناڵەو ناوناو بە کاوەخۆ دەرۆیشتن. لە تاریکیدا نەدەکرا زیاد تاو بدرێ. پێویستیشی نەدەکرد. چ پێویستی بەوە بوو سەریان بەشکان بچێ. کاریان باش و تەواو سەری گرتبوو. تازە لە دەست کێ رابکەن؟ لە چەند منداڵێك؟ لەم دەوروبەرە تا سەد کیلۆ مەتریش بە چواردەوردا باڵندەشی پێدا نافڕێ. منداڵەکانیش، کە

دەستیان بەستراوەتەوە و تەنیا بە دووکونە لووتیان لرخەلرخێك دەکەن. دەبێ بەو چارەنووسەیان شکور بن، کە هەر بەوەندە تەواو بووە... . .

ئەوان چوار ئەسپیان لەگەڵ خۆیاندا رفاندوە و بە حسێبی خۆیان هەریەکەیان جووتێکی پێدەچێ نەك زیاتر. خوابکا و ئەمەیان بۆ قوت بچێ و لەگەروویان گیر نەبێ... . رێگاییێکی دورودرێژی دور لە ئاوە دانیان لە پێشدابوو. تا دەوروبەری تاشکەند سێ رۆژە رێ دەبوو. دەبێ لەوێش وێوەتر بڕۆن. ئێستا تەنیا پێویستی بەوە دەکرد، کە بگەنە مەبەست. کارەکانی دیکەشی هەر وەك ئاو خواردنەوە وایە. لە بازاری تاشکەند گۆشت کێلۆ کێلۆ هەر گەرماو گەرم لە هەوا دەقۆزنەوە. لەوێ خەڵك هی مامەڵە و کڕین و فرۆشتنن. ئەمەیان کاری ئەوانە. زو ساغی کەنەوە. بەرانبەر سێ ئەسپی زۆر باش، کە گۆشتی ئەوان بەزێر هەڵدەکێشرێ و چ پارەییێکی ئەستور لە گیرفانمان دەنێین. بەڵام پارەکان چۆن هەڵگرین و لەگەڵ خۆماندا بیبەین؟ ئەمە خۆی لە خۆیدا پرسیارێکە. گاڵتە نییە. چی لەو هەمو پارە بکەین! بەراستی پارویێکی چەورمان دەستکەوت. ئێستا دەبێ بەخێرایی کاری ببینین. ئەوساکێ دەتوانێ بماندۆزێتەوە. مەگەر با لە سارادا دەگیرێ. پووڵ و پارە هەبێ، گۆڕ غەریب بوون گرفتێك نییە. کاتی خۆیەتی، دەمێکە وەختی هاتوە، کە تا نەگیراوین لێرەوە بدەینە کەندو کەلێنێك. بمانگرن دیارە جێگامان کێیە و دەماندەنە دادگای بیابانی. بەڵام هەڵە دەکەن! پول و پارە هەبێ ژیان هەیە. بێجگە لە تاشکەندیش چەند شارو جێگای دیکە هەیە... . .

لە خۆڕاییە دەڵێن هەر کەسە چارەنووس و ئەستێرەییێکی بەختی خۆی هەیە. بە تەواوی حاڵ وبارمان تێکچوە. ئەوەندەی لەو سەرماوسۆڵەی ناو چیایاندا بە دوای راوی بزنە کێوییێکی مرداردا رابکەین، تازە لەم وەرزە نێچیر گۆشتی هەر هەمووی رەگ و پێگە، جیڕە و لە جوین نایە. جگە لەویش فیشەکیشمان روو لە تەواو بووندا بوو. نەماندەتوانی زۆر سەراندووی نێچیر بنێین. بەڵام لێرە کێ دەیتوانی ئەوەی بە بیردابێ. ئەو منداڵانە بە خۆو هەوجارەکانیانەوە وەك ئەوەی لە ئاسمانەوە هاتبن. خوا خۆی ناردونی! خواییێك هەیە. لەو سەری سەرەوانەوەیە و رزق و بژێوی هەر کەسێکی دابەش ودیارکردوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەسپەکانمان لە لایەکی عارەبانەکە کردەوە و هەڵمان نەبژاردن و هێنامانن. بەڵام هەمویان بژاردەن. لەسەر پەراسوو و دندەکانیان بەئەستووری دوو ئەنگوست چەوری و بەزیان پێوەیە. لەم کاتەدا لەسەر تا سەری جیهاندا لە وێنەیان پەیدا نابێ. گۆشتیان ناسك و بەتامە.، کە گۆشتەکەیان کولاً مرۆڤ حەز دەکا پەنجەکانی پێوە بخوا. خواهەیە. خوای ئاسمانان هەیە. خۆی نێچیرەکەی بە نسیبی ئێمە کرد. خۆیشی مەیلی لەسەر ئەوەبوو، کە لە کارەکەماندا سەرکەوین. ئەوان بە بێ پەلەکردن دوور دەکەوتنەوە. پێویستی بەوە نەدەکرد، کە لە

کێشی ئەسپەکان کەم بێتەوە. قەسابەکانی بازاڕی گەورەی تاشکەند ئەسپی وایان لە خەونیشدا نەدیتوە. دەبا ئەم ڕەزیل و پیسکانە پارەیێکی باشی بژمێرن تا شتێکی باشیان وەگیرکەوێ. ئەوانە، ئەو ژیکەلانە هەر چواریانی جلّەوی چەرمی باشیان هەیە. ئەم جلەوانەیان پێشتر بۆ ئامادەکردبوون. غار دەدەن و دەپڕمێنن. ئەگەر دەیانزانی بەرەو کوێیان دەبەن! ... پێشتر بیریان لە شێوەی بردنی ئەسپەکانیشیان کردۆتەوە. ناکرێ ئەوان بەڕەوە بڕفێنرێن. بەم لاوئەولادا بەرەلادەبن و ڕادەکەن. یەکێك لە ناوەڕاستدا لەسەر زین بوو جلّەوی درێژی ئەسپەکانی، کە دوانیان لەلای ڕاست و دوانیان لە لای چەپدابوون، بەدەستەوە بوون. شریکەکەیشی بە سواری ئەسپێکی(شێ)وە لە دواوەی دەڕۆیشت و بە قامچیەوە لە ئەسپەکانی ڕادەخوڕی تا دوانەکەون. تەنیا هەر بەم شێوە. بە پەلە و نەلەسەرخۆ هەموو کارێك پێویستی بە مێشك و هۆشە، هۆش... . .

١٣- چابدار لە جێگاکەی خۆیدا وەستابوو. سولّتان مراد لە چادرەکە دەرپەڕیە دەرێ و خۆی هەلّدا سەر چابدار و سەری وەرسووراند و نەڕاندی:

- ئاناتای تاودە بەرو ئائیل! دوامەکەوە! هەر بەچوارنالّە! دەنگی خەلّکەکە بدە! من بەدوای ئەوان دەکەوم. دەیانگەمەوە. تەنیا تۆ خێراکە! تۆ ئاکین بەگ لێرە بمێنەوە و یەك هەنگاو لێرە دوور مەکەوە. تێگەیشتی؟ ئاناتای ئەسپەکە تاودە. توند تاوی دە! سولّتان مراد بەو ئاراستەی، کە ڕمبەی سمی ئەسپە دزراوەکانی لێوە بەرگوێ کەوتبوو، بەسواری چابدارەوە تاوی سەند.

بۆ پێشەوە! چابدار براکەی من، بۆ پێشەوە! پێیان بگەوە، بەوان بگەوە. من ناپەڕم و ناگلێم، مەترسە. خێرایتر، خێراتر چابدار. ئەگەر بکوژرێین ئەوا پێکەوە دەکوژرێین. تۆ توندتر وەك با غاردە دوایان. من دەزانم تاریکە. ترسناکە. بۆ تۆش ترسناکە. لەگەلّ ئەمشدا هەر خێرا خێراو خێراتر بالّ بگرە. ئەوان لە کوێن. لەو پێشەوانە چی بەرچاوکەوت، دەجوولّێنەوە. تەنیا لە دەستمان دەرنەچن. خێراتر، چابدار خێراتر... . نەگلێی، نەکەوی... . .

١٤- یەکێك لە دزەکان هەرکە دەنگی سمی ئەسپێکی بەتاوی لە پشت خۆیەوە بیست بەترس و لەرزەوە هاواری کرد:

- بەدوامان کەوتون!

ئەوان ئەسپەکانیان پتر تاوداو ڕۆیشتن. ئێستا کاتی ئەوە نەبوو لەسەر خۆ برۆن. ئێستا هەرچی دەبێ بابێ خۆشبەختی بێ یان بەدبەختی. ئێستا دەبێ ڕاکەین و ئاوڕ بۆ دواوە نەدەینەوە. دزەکەی پێشەوە جلەوی ئەسپەکانی زێتر لەناو دەستی خۆیدا کۆکردەوە و لەسەر زینەکە کەمێك خۆی کوڕ کردەوە. دزەکەی دواوە بەدەم قامچی وەشاندنەوە بە هەموو هێزی ئەسپەکانی لێدەخوڕی و پەلەی

لێدەکردن. لە دەنگی ئەو هەموو ئەسپە، زەوی دەلەرزیەوە. با بەبناگوێیاندا دەیفیکاند. شەو وەك رووبارێکی رەش و خرۆشاو بەخوڕ بەرەو رووی ئەو دەهات. سولتان مراد، کە دەم بە دەم لە دزەکان نزیکتر دەبۆوە و هاواری لێ دەکردن:

- راوەستن، ناهێلم راکەن، راوەستن!

بەلام دەنگی ئەو لەناو ڕمبەوزرمەی پێ لە ئەندازەی چوارنالەی ئەسپەکاندا پچڕپچڕ دەهاتە گوێ.

چابدار! چابداری مەزن! ئەسپەکەی باوکم، چابدار. عەجایب دەڕۆیشت رێك وەك ئەوەی تێدەگەیشت، کە ناتوانێ سەرادویان نەنێ و نەیانگاتەوە و ناتوانێ و مافی ئەوەی نییە لەم غارە بەتاو وترسناکە لە ئەکسای لە جەرگەی شەودا رەتێك بباو بکەوێ. سولتان مراد بە خێرایی گەیشتەوە ئەوان و شان بەشانی ئەوان و لەکەناریاندا دەڕۆیشت. بۆ ئەوان بەخۆو ئەسپە دزراوەکانەوە، راکردن هێندە ئاسان نەبوو.

سولتان مراد هاواریکرد:

- ئەسپەکانمان بدەنەوە! بماندەنەوە! ئێمە جووتیان پێدەکەین!

پاش دزەکە لەبای غاری ئەسپەکەوە سەری ئەسپەکەی وەرچەرخاندەوەو هەلمەتی بردە سەر سولتان مراد و دەیویست لەسەر ئەسپەکەیەوە بیگلێنێ بەلام سولتان مراد وێوەتر چو، ئافەرین چابدار، ئافەرین! سولتان مراد لە پاش دزەکەی بەدوای کەوتبوو دور دەکەوتەوە. بۆ پێشەوە تاوی داو لە لاتەنیشتەوە گەیشتەوە ئەسپەکان و دەستی بە تەنگپێ هەلچنینان کرد تا پێش دزەکە ناچار بێ بسوورێتەوە. ئەو هاواری دەکرد:

- برۆ دواوە، برۆ دواوە.

پێش دزەکە بەدەم وەرگێڕانەوەی ئاراستەی ئەسپەکان هاواریکرد:

- برۆ، دەنا دەتکوژم: بەلام سولتان مراد سەرلەنوێ پێشی گرتەوە و سەرلەنوێ تەنگی بە ئەسپەکان داوە تا نەهێلێ بەرەو پێشەوە غار بدەن. ئەوان بەم پێیە تاویان دەداو هەمووجارێك پاش دزەکە سولتان مرادی دووردەخستەوە و ئەویش هەمو جارێ لەلاییەکی دیکەوە رێگای رفاندنی ئەسپەکانی دەگرت. لەنکاو تەقەی تفەنگێك هات. سولتان مراد ئەو دەنگەی گوێ لێنەبوو و تەنیا گرێکی درەوشاوەی دیت و لە یەك چرکەدا ئاسمانی پان و بەرینی ئەکسای و دەستەیەك ئەسپی رەش و کۆمەلێك مرۆڤ لەکەناری ئەودا تاویان سەندبوو، لەبەر چاویدا بەدیارکەوتن. سولتان مراد لەسەر ئەسپەکەوە بەرەو لاییێك پەڕی و گەوزا، لە خزینی بەسەر بەردێك هەستی بە چووزانەوە دەکرد و

پەڕی و وەستاو یەکسەر زانی، کە ئەسپەکەی هەروا پەڕینێکی ئاسایی نەکەوتووە. ئەسپەکەی لە حالێکدا کەوتبووە سەر لاتەنیشت، لە قەوەژەنی بوو سەری بەزەویدا دەکوتا و نائومێدانە هەر چوار پەلی رادەوەشاند. رێك وەك ئەوەی دەیویست لە جێگای خۆی راپەڕێ و پەل بە غارەوە بنێتەوە. سولتان مراد بەو جۆرەی لەناو دەردو خەمدا بە دەنگی بەرز هاواری کرد، بەبێ ئەوەی خۆشی بزانێ، کە چی دەکا و سەرادووی ئەسپ دزەکانی نا:

- راوەستە! ناهێڵم دەرچن! دەتانگرم! چابدارتان کوشت. چابدار ئەسپەکەی باوکم! ئەو بۆ خۆی بەبێ ئاگا رای دەکرد. ئەو بە رق و تووڕەییەوە رای دەکرد. ئەو بەدوای ئەواندا رای دەکرد و رای دەکرد وەك ئەوەی دەیتوانی بیانگاتەوەو بیانگرێ و بیانهێنێتەوە. ئەسپ دزەکان بە خۆیان و ماڵی دزیاریەوە و دور دەکەوتنەوە. سمی ئەسپەکان لە تاریکیدا بەر زەوی دەکەوتن، ئەوان تا دەهات هەر دور دەکەوتنەوە و بەڵام ئەو نەیدەتوانی و نەیدەویست لەگەڵ ئەم بابەتەدا بسازێ و هەر هەولێدەدا خۆی بگەیەنێتەوە ئەوان. ئەو رای دەکرد و وای هەست دەکرد ئاگری تێبەربووە. لەهەموو گیانی و بەتایبەتی لە دەم و چاو و دەستەکانی، کە پێستەکەی داڕووشابوو خوێنیان لێدەهات و هەستی بە ژان و چووزانەوەیان دەکرد. هەر چەندەی ئەو بەتاو و گورتر رای دەکرد ئەوەندەش دەم و چاو و دەستەکانی بە جۆرێکی لە توانا بەدەر دەسووتاوە. ئەو لە دواییدا کەوت و لەسەر زەوی گەوزی دا و لە حالێکدا قورگی دەگیرا هەوڵی دەدا بەسەر هەناسە سواریەکەیدا زاڵ بێ. ئەو نەیدەزانی دەم و چاو و دەستەکانی، کە زۆر ژانیان دەکرد چ لێبکا. ئەو لەوشەوو ئەو رووناکیی ئاگرەی کە لەبەر چاویدا بەدیار کەوت، هەستی بە تووڕەیی و نەفرەتێکی زۆر دەکرد، گرژی و داچڵەکین سەرتاپای داگرت. ئەو هاواری دەکرد و دەیناڵاند. ئەو گوێ ی لێبوو رەنگی سمی ئەسپەکان پێ بە پێ دوور دەکەوتەوە و کپ دەبۆوە. زەوی هەرچەندەی زۆرتر کزتر و نادیار تر دەلەرزیەوە و ئەوەندە بێدەنگی باڵی بەسەر دەوروبەریدا کێشاو هەموو شتێك بەبێ جولە ماوە. ئەوساکە ئەو هەڵساو گەراوە دواوە و بەدەنگی بەرز و بەرزتر گریا. ئەو بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی خۆی هێمن کاتەوە و دڵی خۆی بداتەوە و لەو ئەکسایە چۆڵ و هۆڵەدا، لەو نیوە شەوەدا کەسێکیش نەبوو، کە دڵی بداتەوە. ئەو بەدەم گریانەوە بەبیری هاتەوە، کە حاجی مراد گفتی داوە کاتێك باوکیان لە جەنگ دەگەڕێتەوە ئەو لەگەڵ خۆیدا ببا. نا، ئێستا ئەو ناتوانێ بۆ پێشوازیی باوکیان، کە لەبەرەی جەنگ دەگەڕێتەوە بەسواری ئەسپی باوکی(چابدار) بەرەو ئێسگە بەتاو بچێ و ئێستا ئیدی نابێ لە ئەکسای ئەوەندەی، کە پێویستە گەنم بچێنرێ و، ئیدی ئەو رۆژە بەشکۆ و پڕ لەسەرمەستییە نایەتەوە، کە ئەوان هەوجاڕەکان بە گاسنی بریسکە داری خاك کێلاو و جووت کردووەوە بەدوای خۆیاندا راکێشن و

بگەڕێنەوە کێڵگەکانی ئەکسای. میرزاگوڵ نایەتە سەر شەقام و خۆشحاڵ بێ. میرزاگوڵ هاتنەوە ناو ئائیلی ئەو نابینێ و بەدیتنی دڵخۆش و بە کەیف و شاگەشکە نابێ... . هەر هەمو ئارەزوەکانی پێکا هاتبوون. سولڵتان مراد هەر لەبەر ئەوەش بوو دەگریا.

١٥- گورگ بەراکردنەوە بۆنی دەکرد، وە لە باوهەوادا باشتر بۆنی خوێنی تازەی دەکرد. زۆر بە خێرایی لەو جێگایە نزیك دەبۆوە، کە بۆنی ئەو عەترە توندەی لێوە دەهات. گورگێکی گەورەبوو. هەر چەندە، کە لە زستاندا ئەو پیرە دڕندە ملێکی ئەستوری بەرازانە، لەڕوڵاواز ببوو. ئەم گورگە زستان تا ئەوکاتەی لە ئەکسای مامزەکێوی هەبوون بە باشی گوزەراندبووی. ئێستا ئەو مامزانەی ئەکسای بە نیازی زاوزێ رویان لە بەردەڵان و چەوەڵانە گەورەکان کردوە. گورگە کەم تەمەنەکان بۆ راوی بزنەکێوی لاواز و داماو لە کوێرە رێگاکاندا، لە چیاکان ماونەتەوە و ئەم گورگە ناخۆشترین رۆژگار بە سەردەباو چاوەڕێ ی دۆزینەوەی مشکە خورماییێکە لەم زستانە هەر ئەوە پەیدا دەبێ. رۆژ دوای رۆژ و سعات دوای سعات چاوەڕێ دەبێ. بەم زوانە دەبێ مشکە خورما بۆ بەر هەتاو بخزێ. تەنیا ئەمە تاکە هیوای رزگار بوونی بوو. ئەو مشکانە چ ماوەییێکی دورودرێژ لە کون و لانە قوڵەکانیدا، کە کەس دەستی پێیان نەدەگەیشت، لێی درێژ ببوون و لێی وەرکەوتبوون! بۆ ئەم گورگە ژیان لە ئەکسای لەم رۆژانەدا چ برسێتی و خەفەتێکی بەدەمەوە بوو! گورگە هەستی بە تووڕەییەکی نادیار و خرۆش و جۆشێك دەکرد و ترسی ئەوەی هەبوو نەوەکا کەسێکی دیکە دەست بۆ نێچیرەکەی بێنێ و بەشداری بکا. بەرەو بۆنی شەیداو خۆشی خوێن رای دەکرد. نێچیر - گۆشتی ئەسپ بوو. بۆنی ئارەقە و گۆشت ئەسپ کەللەی گورگەی وڕوکاس کردبوو. ئەم دڕندە لەسەرانسەری ژیانی خۆیدا شێ چوار جاران توانیبوی لەگەڵ گەلەگورکان پلە گۆشتێکی چەوری ئەسپی چنگ کەوێ. گورگ لە حاڵێکدا لیکی دەمە نیوەکراوەکەی دەرژاو رای دەکرد، ئەم گورگە لە هەناوە خاڵیەکەی خۆیدا هەستی بە قۆرەقۆری زگی دەکرد و لینگی دەدا. بەشێوەی سێبەرێکی تاریك لەناو تەمێکی خۆڵەمێشیدا لە باوەشی سەر لەسەحەران رای دەکرد. گورگە بە هەمو حیرس و ئارەزوێکی، کە هەڵمەتی راستەوخۆی بۆ سەر نێچیر هەبوو. بەفەرمانی غەریزە بەسەر ئەم حیرس و ئارەزوەدا سەرکەوت. لە دورەوە سووراوە و لەم کاتەدا حەپەساو وشك بوو - لە کەناری ئەسپە کەوتوەکەدا مرۆڤێکی دیت. ئەو مرۆڤە بەترسەوە کەمێ راستبۆوە. سولڵتان مراد بە خێرایی لێی راپەڕی و قاچی بە زەوی دادا و گوتی:

- ئاهای ئاهای!

گورگە گەڕاوە دواوە و کلکی شۆڕکردبوو بەناو هەردو پەلەکانی دواوەیدا شۆڕ ببۆوە [illegible] مەیلیەوە دورکەوتەوە. دەبوو دوورکەوێتەوە. لێرە مرۆڤ هەیە. مرۆڤ ڕێگری بوو، کە نێچیرەکە ببێتە هی ئەو. گورگە پاش کەمێك پاشەکشە لە پڕ بەتوندی پێی چەقاند و بەدەنگێکی نادیار و خەفەوە مڕاندی بەرەو لای ئەو گەڕاوە. چاوەکانی گورگەکە بە ترس و شەرانییەوە کسکەی هات و لە حاڵێکدا کەمێك سەری خۆی هێنابووە خوارێ و ددانەکانی نیشاندەدا و گڕی دەکردن و تورەببوو لەسەرخۆ کەوتە نزیك بوونەوە. سوڵتان مراد بە دەنگێکی پڕ لە هەرەشەکردنەوە وەستاندی و توانی لغاوکە لەسەری چابدار دەربێنێ. ئەو خێرا لغاو و جڵەوەکەی لوولدا و ئاسنی لغاوەکەی بەسەری جلەوەکەدا شۆرکردەوە. ئێستا ئاسنی لغاوەکە چەکی دەستی ئەوبوو. گورگە نزیکتربۆوە و باڵی خۆی گیف و خۆی بە زەویەوە چەسپاند و وەك زەمبەلەی فشاردارو بەر لە هەڵبەزینەوە لە جێگای خۆیدا بێ جووڵە ما. سوڵتان مراد بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا بە جۆرێکی روون و ئاشکراو هەستپێکراو گوێی لە تەپەی دڵی خۆی بوو. دڵی ئەو لەناو سینگی دا وەك کۆمەڵە گلۆپێکی فشاردراو هەستی پێدەکرا سوڵتان مراد واهاتەوە و لغاوەکەی بۆ وەشاندنی زەبرێکی کوشندە بۆ دواوە برد و چاوەڕێ ی هێرشی گورگە، کە بوو... .

گوندی. بایتیك مانگی مای ١٩٧٥.

---

**روونکردنەوەیەك:**

ناوی سەرەکیی رۆمانەکە بەزمانی عەرەبی (**کلنگهای زودپرواز**)ە. لە وەرگێڕانە کوردییەکەیدا بۆ ئەوەی ناوێکی لە زەین نزیك بێت ناچاربووین واز لە دەستەواژەی (**زودپرواز**) بێنین کە واتای (**زوو هەڵفڕین**) دێت و مەبەست لەو قورینگانەیە کە زووتر لەکاتی خۆی هەڵدەفڕن و کۆچ دەکەن. بۆیە بەڕاوێژ لەگەڵ چەند کەسێکدا هاتینە سەر ئەوەی ناوی کتێبەکە بکەینە **(قورینگە کۆچەرییەکان)**